


- ناوی کتێب: فەرهەنگی وشەنامە
- نووسینی: جمال حبیب الله فرج
- سەرپەرشتی هونەری و بەرگ: عوسمان پیرداود
- نەخشەسازی: عیسام محسن
- پیت چنین: یوسف جمال حبیب الله
- هەڵەچنی: جمیله جمال حبیب الله
- بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە (٧٨).
- تیراژ: ٧٥٠ دانە
- لە کتێبخانەی گشتی هەولێر، ژمارەی سپاردنی (١٦٠)ی ساڵی (٢٠١٠)ی دراوەتێ.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفُ أَلۡسِنَتِكُمۡ وَأَلۡوَٰنِكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡعَٰلِمِينَ ٢٢ ﴾سورة الروم.

(( ئەگەر ئێژن : چیاکانی هۆرامان سەخت و گەردن کەش و بڵندن،
ئێژم : زمانەکەیان لەوان بەرز و بڵند ترە ..
ئەگەر ئێژن : گژ و گیا و گوڵ و گوڵاڵەی هۆرامان ڕەنگینە ،
ئێژم : زمانەکەیان لەوان ڕەنگین ترە ..
ئەگەر ئێژن : کانیاوەکانی هۆرامان پاك و ساف و زوڵاڵن،
ئێژم : زمانەکەیان لەوان سافتر و پاراو تر و زوڵاڵ ترە ..
ئەگەر ئێژن : هەنگوینی هەنگەژاڵەی هۆرامان شیرینە،
ئێژم : زمانەکەی لەو هەنگوینە بەتام تر و شیرین ترە.. ))

## پێشکەش بێت :

بە گیانی باوکم ، ئەو باوکەی کە هەڵۆی مەرگ زۆر زوو فڕاندی لێم و، هەر بە منداڵی منی لە نازی بێ بەش کرد و، نەی هێشت تاسەمان لە یەکتر بشکێت . نەیهێشت سیمای لە چاڵ و چۆڵەکانی مێشکمدا جێگیر بێت.

بەگیانی دایکی خوا لێخۆشبووم (عدلە محمد خودادا) ، ئەو دایکەی کە جێگای باوکیشی گرتەوە بۆم. بەو نەخوێندەواری یەی خۆی چڵەپۆپەی دڵسۆزی بۆم نواند، پاك ترین پەروەردەی کردم، سەرەتاکانی ئاخاوتن هەر لەوەوە فێر بووم، چەندان ساڵ بە بێوەژنی و هەتیو باری، بە دیارمانەوە مۆم ئاسا خۆی ئەتواندەوە و ڕێگەی پێگەیاندن و پەروەردەی بۆ ئێمە ڕۆشن ئەکردەوە، تا دوا هەناسەی ژیانی سۆز و میهرەبانی خۆی لێ نەگرتینەوە.

بە هاوسەری هێمن و ئارام و بە وەفام (( ئەختەر)) ی مەلا کەریمی دەگاشێخانەیی، کە لە دانانی ئەم فەرهەنگەدا ئەو پەڕی یارمەتی دام . هەر پرسیار و هەر داوایەکم لێ کردبێت ، هیچ کامیانی بێ وەڵام نەهێشتووەتەوە. بەڵێ ، بەو خوێندەواری یە زۆر کەمەیەوە ، لە مەیدانی شێوە زاری هۆرامییدا، تەواو لێزان و ووریا و زیرەکە، ئەتوانم بڵێم : گرنگترین سەرچاوە بوو بۆم لە بەشە هۆرامی یەکەی فەرهەنگەکەداو، ئەوپەڕی سوودی پێ گەیاندم.

بە گیانی پاکی ماندووی بێ باکی شادمانی هەموو هۆرامی یەکی: ڕەنجدەر. ڕەنجبەر، کۆڵێش ، کۆڵبەر، کۆکەن، باخدار، ڕەزدار، جووتیار، سنعەتکار ، دەڵوەتدار، هەربەنە، زەحمەت کێش، ماف خوراو ، ستەم دیدە، خوێندەوار و نەخوێندەوار، هەژارو دەوڵەمەند، دەنگ خۆش و بەهرەمەند، گەورە و بچووك، بەویقار و ڕۆح سووك، قسە خۆش و زمان شیرین، لە هەر کوێدا هەن و دەژین.

بەهاوڕێی سەردەمی فوتابێتی و سەربازی و مامۆستایەتیم ( م. عبداللە عبدالعزیز ) ئێناخی، کە لە وەڵامی هیچ پرسیارێکمدا درێغی نەکرد.

بە یەکە یەکەی ڕۆڵە دڵسۆز و پاکەکانی نەتەوەی کوردی پارچە پارچە کراوی ماف زەوت کراو. بە تایبەتی ئەوانەی هەستی پاکی نەتەوایەتیان هیچ گەردێك نایگرێت و، شەیدا وئەویندارى گوڵزاری زمانن و، لەرەی ئاوازە و ناسکیی ووشە، خونچەی ئارەزووی دڵی پاکیان دەپشوێنێ.

**جمال حبیب اللە فرج (( بێدار ))**
**٢٠٠٣/٩/٢٧ – هەڵەبجەی شەهید.**

# پێشەکیی لیژنەی فەرهەنگ

هۆرامی، یاخود هەورامی کە وشەیەکی زیاتر باوە لەسەر زاری خەڵکی کوردستان، یەکێکە لە شێوەزارە سەرەکییەکانی زمانی کوردی. جا ئەگەر چی هۆرامی (وەك دانەر خۆشی باسی لێ دەکات) شێوەزمانێکی کۆن و دێرینە، بەڵام تا ئەمڕۆ فەرهەنگێك وەك سەرچاوەیەکی دیار بەم شێوەزارە لای خەڵك، بوونی نییە.

لێژنەی فەرهەنگ لە ئەکادیمیای کوردی لەرووی ئەوەی کە ناساندنی هەموو شێوەزارەکانی زمانی کوردی بە ئەرکی خۆی و کارێکی پێویست دادەنێت، ئەم بەرهەمەی مامۆستا بێدار دەخاتە بەردەست. ئەم کارە نەك هەر کەلێنێکی دیار لە فەرهەنگسازی کوردیدا پڕ دەکاتەوە، بەڵکو کاریگەر دەبێت لە نزیککردنەوەی شێوەزارەکان لە یەکتری کە دەشێت ئەرکێکی سەرەکیی فەرهەنگسازیی کوردی بێت.

ئەو شارەزایانەی ڕەشنووسی ئەم وشەنامەیەیان بینیوە و هەڵیانسەنگاندووە، ئەم بەرهەمە نەك هەر بۆ خودی زمانی کوردی بەسوود دەبینن، بەڵکوو وا مەزەندە دەکەن کە "بۆ ئاستی خوێندنی بەرایی لە زانکۆ و خوێندنی باڵا دەتوانرێ پشتی پێ ببەسترێت..... و ئەو وشە و زاراوە و دەستەواژانەی شی کراونەتەوە بەسامانێکی بەنرخ" دەزانن.

ئەوەی لەبایەخی ئەم وشەنامەیەش زیاد دەکات ئەو وردەکاریەیە کە دانەر لە هەندێك لایەنی زمانەوانی و فەرهەنگسازیی ئەم وشەنامەیەدا کردوویەتی. دەنگ و شێوە دەنگەکانی خودی زاری هۆرامی ڕوون کراونەتەوە و لە دانانی ئەم وشەنامەیەدا چوار شێوە پیت لەڕووی پێویستییەوە و زیاد لە پیتەکانی ئەلفوبێی ستانداردی زمانی کوردی بەکارهاتووە و پێویستی بەکارهێنانیان ڕوون کراوەتەوە، بەڵام ئەم چوار شێوە پیتە تەنها تایبەتن بەشێوازی هۆرامی، واتا نابن بە بەشێك لەو ئەلفوبێیەی کە سەلمێنراوە و بەگشتی زمانی کوردیی پێ دەنوسرێت.

ئێمە لێژنەی فەرهەنگ لە ئەکادیمیای کوردی لەو بڕوایەداین کە چاپکردنی ئەم وشەنامەیە دەوڵەمەندکرادنی بوواری زاراوە و فەرهەنگسازی زمانی کوردی دەگەیەنێت.

**لیژنەی فەرهەنگ**

## (( پێشەكی))

**ستایش هەر شایستەی خوایە، ئەو خودایەی کە نـە ڕۆڵـەی هەیـە، نـە بابـە و نـە دایە .. یـەك بـاڵ و تـاك و تەنیایـە .. بـێ دەرد و بـێ مـەرگ و زایـە.. بـە دیهێنـەری ئاسمـان و دنیایــە .. لــە کارەکانیــا دانایــە .. بــە هــەموو شــتێك زانایــە .. باســی نیعمەتەکانی هەرگیز کۆتایی نایە .. خۆیشی بێ سەرەتا و بێ کۆتایی یـە .. حـاکم و پاشای بێ هاوەڵی، بێ مامەندی ڕۆژی دوایی یە.**

**سەلات و سەلامی هەمیشەیی، بۆ سەر گیانی پاکی نـەمری پێغەمبـەری ئیـسلام . لەوەوە سەرواز بکات بۆ سەر گیانی خانەوادە و یاران و شوێن کەوتوانی، بە تایبـەتی ئەوانەی کە هەرگیز تێر نابن لە ئەوینی سفرە وخوانی.**

**پاشان ..** ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّلْعَـٰلِمِينَ ﴾ **آية (٢٢) سورة الرّوم**

**یەکێك لە بەڵگە و نیشانەکانی دەستەڵات و زانایی و دانایی خوای گەورە ئەمەیە، لە کات و حاڵێکدا کە میوەکان هەموو یان هەر میوەن، هـەر نیعمـەتی ئـەو خوایـەن، هەموو لەسەر ئـەم زەویـەن، بـە هـەمان ئـاو و هـەوا و خـۆراکی ئـەم زەویـە، لـە ژێـر سایەی یەك ئاسماندا و، بە تیشکی یـەك خـۆر دەڕوێـن و پێدەگـەن و دەژیـن و دێنـە بەرهەم، کەچی جۆرا و جۆر و، ڕەنگا و ڕەنگ و شکڵا و شکڵ و، لـە قـەبارە و تـام و بـۆن و نـرخ و چـاکی و پـاکی و جوانیـدا جیـاوازن. بـەم سـیفات و تایبەتمەنـدیی یانەشەوە زیاتر ڕازاوە و چاك و دڵگیر و بە تام دەبن.**

**ئینسانەکانیش هەر بەو جۆرە ، هەموویان لە بنەڕەتا لە یەك بـاوك ( آدم ) ن و، لە یەك دایك (حواء) ن – سلامی خوایان لێ بێـت- . هەموویـشیان لەسـەر گـۆی ئـەم زەوی یە، بە خێر و خێراتی ئەم زەوی یە، لە ژێر چەتری یـەك ئاسمانـدا، بەهـەمان ئاو و هەوا و خۆراك و تیشك پێ ئەگەن و ژیان ئەگوزەرێنن، کەچی خوای زانا و دانا بە حیکمەتی بـێ پایـانی خـۆی، کردوونـی بـە چـەندەها گـەل و میللـەت و نەتـەوە و عەشیرەت و هۆز و خێڵ و ڕەنگ و دەنگی جۆراو جۆری جیاوازەوە .. هەر یەکەشیان سیما و ڕوخسار و ڕەنـگ و دەنـگ و داب و نـەریت و خـوو و خـدە و جل و بـەرگ و سروشـت و عـادەت و ڕەوشـت و کەلـەپوور و فەرهـەنگ و زمـانی جیـا جیـا و جـۆری**

تایبەتی ژیانی خۆی هەیە .. بگرە هەر یەکەیان زێد و یاسا و ڕێسای جیا و ئاییینی تایبەتی خۆی هەیە.

یەکە یەکەی ئەو گەل و میللەت و نەتەوە و عەشیرەت و هۆز و خێڵ و ڕەنگ و دەنگە جۆرا و جۆر و جیاوازانە. ئەو سیفات و تایبەتمەندیی یانەی خۆیانیان خۆش دەوێت و، بگرە شانازیشیان پێوە ئەکەن، حەز ئەکەن و هەوڵ ئەدەن بیانپارێزن و بیانهێڵنەوە. چونکە بوون و مانەوەی خۆیان، لە بوون و مانەوەی ئەواندا بەدی ئەکەن. ئەمەش نەزعەیەکی پاکی ڕەوای سروشتی یە و، یاساکەی لە یاساکانی خودای پەروەردگارە و، پەیڕەوی کردنی بە ژیرانە کارێکی جوانی پیرۆز و بە کەڵك و بێ زیانە.

## هۆرامی و فەرهەنگ

ئێمە کە باس لە پاراستن و هێشتنەوە و پارێزگاری کردنی زمان ئەکەین ، ئەبێت ئەوە بزانین کە بەهێزترین و ئەمین ترین قەڵا و سەنگەری ئەو هێشتنەوە و پارێزگاری یە، (( فەرهەنگ)) یان قامووس ((وشەدان)) ە بۆ ئەو زمانە.

دیار و زانراوە هەر لە کۆنەوە هەتا ئەمڕۆ، یەکەمین شناسنامە و دیارترین دیاردەی ئاشکرا و روون، کە هۆرامیانی پێ ناسراوە و پێی دەناسرێن لە ناو خێڵ و هۆز و تیرە و عەشیرەتەکانی گەلی کورددا، زمانەکەی یاخۆ شێوە زمانەکەیەتی، کە پێی دەوترێت ((زمانی هۆرامی)) . تا ئێستاش برێکی زۆر لە برا سۆرانی یەکان بە زمانی ((ماچۆ)) یان بەزمانی ((تاتۆ)) ناوی ئەبەن.

لەگەڵ ئەوەشدا، کە زمان یا شێوە زمانی هۆرامی، کۆن و دێرین .. ڕەسەن و قووڵ و فراوان .. تەڕ و پاراو و بەتام .. گوشاد و دەوڵەمەند .. ناسك و ساف و سۆڵ .. بەتام و چێژ .. بەهێز و بەپێز .. خاوەن دەستوور و یاسا و ڕێسای بەهێز و مەحکەم .. دارای ڕێزمانێکی پڕ لە وورده کاریی و کەم وێنە .. دەست ڕۆشتوو و دەوڵەمەند لە ڕووی ڕەچاو کردنی نێر و مێوە .. لە ڕووی مەجازی و حەقیقی و سەماعی و قیاسی یەوە .. لە ڕووی جێناوی فرەی فرە جۆرەوە .. لە ڕووی ئامرازەکانی: ئیشارەت، ناسراوی و نەناسراوی، سیفەتەکانی فیعل و فاعل و مەفعول، سیغەی بەردەوامی و مفعولی مطلق، زۆریی پێشگر و پاشگرەوە ..

لەگەڵ ئەوەشدا کە زمـان یـا شـێوە زمـانی هـۆرامی، وەك هـەموو شـێوەزمانەکانی تری گەلی کـورد، دەوڵەمەنـد و مۆسـیقی و لـەبارە و بناغەیـە بـۆ مێـژووی کـوردی و ئـەکرێت بـە یـەکێك لـە زمانـە زینـدووەکان بـژمێررێت، کەچـی بـە داخـەوە هـەتا ئێستاش – ئـەوەی پێـی بڵێیـت ((فەرهـەنگ)) واتـە ((قـامووس)) نـی یـەتی !! ئـەم تاوانە بدەینە پاڵ کێ؟

هەروەها، لەگەڵ ئەوەشدا کە هۆرامان مەڵبەندی خوێنـدن و خوێنـدەواری بـووە، لانکـەی زانایـان و ئـەدیبان و شـاعیران بـووە و، ئـەمڕۆ مێـژووی ئـەدەبی کـوردی گەواهیی بـۆ دەدات و شـانازی پێـوە دەکـات و کـۆنترین دەقـی نووسـراوی ئـەدەبی بـە هۆرامی ئەخاتە ڕوو .. لە گەڵ ئەوەشدا کە هۆرامیان خۆیان بە ژیـری و زیرەکیـی و بیر تیژیی و خەیاڵ فراوانـی و وردبـینی و وردەکـاری و سـەلیقە داری و دووربـینی و هۆرامی پەروەری و زۆریی ژمارەی خوێندەوارانیان – لەناو هۆز و تیرەکانی کورددا - ناسراو و بەناوبانگن، کەچی بە داخەوە هەتا ئێستاش زمانەکەیان بێ فەرهەنگە!!

ئاخۆ تـاکو ئێـستا چـەند هـەزار وشـەی زێـڕینی دێـرینی ڕەسـەنی ناسکی پـاراوی بــەهێزی ئــاوازەداری بــێ وێنــەی زمانەکــەیان، چــەند زاراوەی پتــەوی شــیرینی زمانەکەیان بە گێژەڵۆکەی زەمەن هەڵوەری بن و لە بەین چووبن؟! ئەگـەر زمانەکـە هەروا بێ فەرهەنگ و بێ وشەدان بمێنێتەوە، ئەی ئەبێ وشـەکان و زاراوەکـانی تـری چیان بەسەردا بێت؟ دواڕۆژی دووری زمانەکەیان بەچی ئەگات؟

## گرنگیی زمان

ئەوەی من لێرەدا ئەمەوێ سەبارەت بەزمان بیڵێم، گرنگی زمانە لـە ژیانـدا نـەك پێناسەی وردی دوور و درێژی زمان.

ئاشکرا و دیارە، کە تا ئەمڕۆش گرنـگ تـرین ڕێگـە کـە ئـادەمیزاد بـە تێکـڕا و بـە ئاسانی و ئاسایی، بتوانێت بە هۆیەوە لە خەڵکی تێبگات و خەڵکیش لە ئەو تێبگـات، زمانە.

هـەروەها زمـان دیـاردە یـاخۆ تایبەتمەندییـەکی گرنگـی ڕوونـی لـە بەرچـاوە کـە ئادەمیزاد لە گیان لەبەرەکانی تر جیا ئەکاتەوە. زمان پایەی هەرە گـەورە و بناغـەی بــەهێزی کۆشــك و قــەڵای کۆمەڵایــەتی و نەتەوایــەتی یــە، ئاشــکراترین پێناســە و

شناسنامەی گەل و نەتەوەیە، هەوێنی هەستی نەتەوایەتییە لە سەرانسەری جیهانـدا و، لەوانەیە هەروەهاش بۆ خۆی بمێنێتەوە. کە زمان هەبوو، گەل و نەتەوەش دەبن، یان بە لایـەنی کەمـەوە ژێلـەمۆی هەسـتی نەتەوایـەتی دەبێـت .. کـە زمـان نـەبوو و نەما، ئیتر گەلی چی و نەتەوەی چی؟! هـەر گـەلێك نـەیتوانی بێـت زمانەکـەی خـۆی بپارێزێت، لەگەڵ توانەوەی زمانەکەیدا خۆی وەك کلۆسـندری بـەر بـاران تواوەتـەوە، وەك بڵقـی سـەر ئـاو، یـان وەك خـەتی سـەر ڕووی بیابـان تیاچـووە وشـوێنەواری بڕاوەتەوە. ئەمە هەر وەك وەها بووە، ئێستەش وایە، لەمەو دواش هەروەها دەبێت.

بەم جۆرە، هەروەك مامۆستا (شێخ محمدی خـاڵ) لـە پێـشەکی فەرهـەنگی خاڵـدا دەڵـێ: ((زمـان مایـەی مانـەوەی گەلـە ...... ، زمـان بـۆ ئاگـاداریی گـەلان لـە هـەموو قەڵایەکی ئاسنین و، قوللەیەکی مسین باشتر و چاکترە چونکە قـەڵا ئـەگیرێ و قوللـە ئەڕوخێنرێ، بەڵام زمان هیچی لێ ناکرێت)).

مامۆستا هەژاری ڕەحمەتی، لە پێشەکی((هەنبانە بۆرینە)) کەیدا ئەڵێ:

(( زۆر لـە ڕۆژ ئاشـکراترە ، پێناسـی گـەلان لـە جیهانـدا، دروشمـی نەتەوایـەتی، ئامیانی ڕەگەزایەتی زمانە و بەس)). دەی کەوابێ، گرنگی دان بـە زمـان .. پاراسـتنی و ئاگاداری کردنی .. ئاوەدان کردن و پاراو کردنـی .. بـژارکردن و پـەرژین کردنـی .. لەگەڵـدا خـەریك بـوون و خـۆش ویـستنی .. زینـدوو کردنـەوە و ڕاگـیر کردنـی .. هێشتنەوە و پارێزگاری کردنی، ئەرکێکی گەورەی زۆر گـرنگ و بنـەڕەتیی سەرشـانی هەموو ڕۆڵەیەکی پاك و ژیر و بەوەفا و بە ئاگای هـەر گـەل و نەتـەوە و میللەتێکە. بـە پێـچەوانەشەوە، خـستنە پـشت گـوێی ، کەمتەرخـەمی نوانـدن بەرامبـەری، بـە تایبەتی لە لایەن ڕۆڵەکانی خۆیەوە کە خاوەن توانا و زانان، تەمبـەڵی کـردن و نـرخ بۆ دانەنانی، ئەگەر ناپاکی و سپڵەیی و بەد ئەمەکی نەبێت، بێ گومان سستی و بـێ قابلیەتی و بیر پووچەڵی یە و، گەل و نیشتمانیش مێـژوو ئەکەنـە نوێنـەری خۆیـان کە هەتا هەتایە گلەیی بکات و باسەکە بکۆرێنێتەوە.

ئایا بە کردنی وشکە گلەیی کەلێنەکە پڕ ئەبێتـەوە؟ دەبـێ ئەوسا گلـەیی لـە کـێ بکـەین؟ ئـەی پێـشینان نـەیان گوتـووە : ((خـۆت سـەری خـۆت نـەخورێنی کـەس نایخۆرێنێ بۆت))؟

من وای بۆ ئەچم، تەنها ڕێگەیەك کە ئەبێ بگیرێتە بەر بۆ چارەسەر کردنی ئەم کێشەیە، دانانی فەرهەنگێکە، کە تێکڕای وشە و زاراوەکانی زاری هۆرامی بگرێتە ئامێز و، دایك ئاسا جگەر گۆشەکانی خۆی بپارێزێت. چونکە – پێشتر گوترا – فەرهەنگ باشترین قەڵای پۆڵایینە بۆ پاراستنی زمان .. گونجاوترین سەنگەری دیفاع کردنە لە خۆ .. شایان ترین گەنجینەیە بۆ هەڵگرتنی سووری خەرمانی هەر زمانێك . فەرهەنگ ئەگەر فرە نەبێ و نەیەتە سەری، کەم نابێتەوە و لێی نایەتە دەر.

## بیرۆکەی ئەم فەرهەنگە

من هەر بە منداڵی .. لە پۆلی چوارەمی سەرەتاییەوە، خۆش ویستنی شیعر بوو بە خدە و خوو و ئارەزووم. ئەو شیعر خۆش ویستنە بردمی بەرەو ئاشنا بوون و شەیدا بوونی وشە و زاراوە و عیبارەتی جوان و ناسك و شیرینی قووڵ و واتادار. بەکورتی، تام و چێژێکی زۆرم لە ((دانە)) کانی زمان وەرگرت، بە تایبەتیش زمان یان زاری هۆرامی، چونکە من خۆم لە بنەڕەتا هۆرامیم.

لە ساڵی (١٩٧٨) دا، کە حکومەتی ئەو کاتەی عێراق بە بیانووی نزیکی ی گوندەکان لە سنووری ئێرانەوە و، بە بیانووی ئاسایشی وەڵاتەوە، دەستی کرد بە وێران کردنی گوندەکانی کوردستان و خەڵکەکەشی ڕاپێچ کرد بۆ ئۆردوگا زۆرە ملیەکان ، کە ئەو بە (( قرى عصرية)) ی ناو ئەبردن، هۆرامانیش بەر ئەو شاڵاوە بێ فەڕە کەوت. خەڵکەکەی ڕاپێچی ئۆردوگا زۆرە ملیەکان کرا. تیرە و هۆز و خێڵ و بنەماڵەکان هەموو تێکەڵ بە یەکتر کران. لەم کاتەدا من زیاتر دڵم داخورپا و وام هەست ئەکرد، ئیتر زمانی هۆرامی کەوتووەتە بەر هەڕەشەی توانەوە و تیاچوون. لەو کاتەدا، لەم خەم و خەیاڵە بەدەر هیچ شتێکی ترم بە بیردا نەهات.

لە دوای کیمیابارانەکەی شاری هەڵەبجە، لە (١٦-٣-١٩٨٨) دا، من بە خێزانەوە، لە ئۆردوگای ((سەرابی فەش))، سەر بە قەزای ((کەنگاوەر/ ئوستانی کرماشان)) گیرسامەوە. لە هاوینی ئەوساڵەدا، بۆ سەردان لە یەکێك لە خزمە ئاوارەکانمان ، لە سەرابی فەشەوە چووین بۆ ((دووڕۆ)) ی سەر بە قەزای مەریوان، بەرامبەر پەخشی ((سەڵۆاوا)). لەم لای کامیارانەوە بەرەو سنە ئەهاتین، دارودرەختمان لێ دەرکەوت،

یەکێك لەو دارانە ((دار بەڕوو)) بوو. یـەکێك لـە کوڕەکـانم لێمـی پرسـی: (( تاتـە ئـا درەختە چێشا؟)) وتم: (( ڕۆڵە ! ئانە نەرەن)). وتی: (( نەرە چێشا؟)) وتم: (( نـەرە ئا درەختەنە هەکە بەلوو گێرۆ)). وتی: (( ئەی بـەلوو چێـشا؟)) وتم: ((ئانـە ئـەوەڵ جار لەقە هەژگ بی یەن، هۆرشا پاتـەن و ئـیتر زل بـی یـەن و بـی یـەن بـە نـەرە)). یەکێك لە کچەکانم ڕووی تێکـردم و پرسـی: (( تاتـە! ئـەی هەژگـە چێـشەنە؟)) وتم: پەلەمەکەن .. دوایی .. دوایی تێتان ئەگەیەنم.

ئەو پرسیارانە سەر لـە نـوێ دڵمیـان داخورپانـدەوە و لـە دڵـی خۆمـا گـوتم: ئـای! ئەوەی کە بە خەیاڵ لێـی ئەترسـام ، ئـەوا ئـەمڕۆ بـوو بـە ڕاسـتی و واقیـع!! کەوتمـە گێژاوی خەیاڵات و پەژارەوە .. کەوتمـە بـیر کردنـەوە .. بـەڵام لـەو ئاوارەییـەدا، بـەو بەسەرهات و ماڵ وێرانی یە، نەڕێم لە چارەسـەرێك کـەوت ، نەشـتێکم پـێ کـرا. بـۆ خۆم دۆش دامام.

منداڵـەکان ناهـەقیان نـەبوو کـە دار و درەخـتی کوێـستان نەناسـن و ناوەکانیـان نـەزانن، چـونکە گـەورەترین منـاڵم ، لـەدایك بـووی ناوەڕاسـتی سـاڵی (١٩٧٣)) بـوو. منـیش لـە کۆتـایی سـاڵی (١٩٧٦) - وەك مامۆسـتا لـە گونـدی ((سـەرگەت)) ەوە گوێزرامەوە بۆ گوندی ((پریس)) ی سەرووی نزیـك بـە هەڵەبجە. دووساڵ لـە دوای ئەمـەش هۆرامـان وێـران کـرا، ئـیتر هـەموو لـە هۆرامـان دابـڕاین، منداڵـەکانم لەگـەڵ منـاڵانی سـۆرانی زمانـدا دەژیـان و دەدوان. لێـرەدا ئەمـەوێ بڵـێم : بیرۆکـەی فەرهەنگێگی هۆرامی، لە پرسیارەکانی منداڵەکانمەوە ، لـە ڕێگـەی نێـوان کامیـاران و مەریواندا، لە مێشکمدا چەخماخەی دا و،چەخماخەکە هەر مایەوە و نەڕەوییەوە.

لـە کۆتـایی سـاڵی (١٩٩٤) ز دا ئێرانمـان وەك - پـەنا هەنـدە - بـەجێ هێـشت و گەڕاینەوە بۆ عیراق و لە ((هەڵەبجەی تازە)) نیـشتەجێ بـووین. لـەم مێـژووەوە مـن خۆم یەك لایی کردەوە و ڕووم کردە جیهانی ئەدەب و نووسین، ئەمەش وای لێ کردم سـەرم بتـەقێت بـە فەرهـەنگ یـان قامووسـەوە. ئەمـەش بـوو بـە کلیلـی دەرگـای جیهـانێکی نـوێ لـە بـەردەمما، هـەر بەمـەش سـەرلە نـوێ چـەخماخەی بیرۆکـەی فەرهـەنگێك بـۆ زاری هـۆرامی بەرمێـشکم کەوتـەوە و کەوتمـە کەڵکەڵـەی دانـانی فەرهەنگێکی هۆرامی.

بەڵام مـن و فەرهـەنگ دانـان؟ زۆر لـە یەكـەوە دووریـن! ئـاخر فەرهـەنگ دانـان كاری كۆمەڵە كەسێكی شارەزایە .. من شتێكی ئەوتۆی لێ نازانم .. لەم ڕووەوە زانست و زانیاری یەكی تێر و تەسەلم نی یە .. ئەم كـارە توانـای ئـەوێت و كـاری گەرەكـە .. پێویست بە یارمەتی و هاوكاری دەكات .. ئاخر من سەرچاوەیەك شك نابەم تا بیكەم بـە بناغـە و پـشتی پـێ ببەسـتم .. ئـەم كـارە بـە تـەنیا كەسـێك ناكرێـت .. كەسـانی خوێنـدەوار و بـە تەمـەن و بـە ئـەزموونی ئـەوێ .. ئـەم هـەموو شـتانەم چـۆن پـێ ئەكرێت؟

ئەم بیرۆكەیەم - بیرۆكەی دانانی فەرهەنگێكی هۆرامی — بۆ چەند كەسـێك بـاس كـرد، هـەموویان بـە چـاكیان زانـی، بـەڵام بـە ((موسـتەحیل)) یـشیان زانـی، بگـرە دڵیـشیان سـارد ئەكردمـەوە. لەگـەڵ ئـەو هەمووەشـدا، بیرۆكەكـە نـەك هـەر نـەمرد، بەڵكو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پەرەی ئەسەند و بڵێسەی بەتین تر دەبوو لـە ناخمـدا. هـەتا وای لێ هات، بوو بە دارێـك، لـە زەمینـەی دڵ و دەروون و بـیر و خـەیاڵما ڕووا، ڕەگـی داكوتا، لق و پۆپ و گەڵا و گوڵی دەركرد.

ئەوسا خۆم بە خۆمم دەگوت: ئەی پیاو! تۆ ئەگەر خۆت بە دەستی خـۆت سـەری خۆت نەخورێنی، ئەی كێ بۆت بخورێنێ و بەتەمای كێیت؟! ئەوندەی دەمـت مانـدوو ئەكەیت ، دەی دەستت ماندوو بكە.؟ باشە، تۆ خۆت بۆچی بەم كارە هەڵناسیت؟ تـۆ خـۆت هۆرامیـت .. لـە هۆرامـان لـە دایـك بوویـت و ژیاویـت .. تەوێڵـەییت و چـەند سـاڵێك لـە تەوێڵـە ژیاویـت .. ماڵتـان هاتۆتـە دەگاشـێخان .. قۆنـاغی سـەرەتایی خوێندنت لە بیارە تەواو كرد .. شەش ساڵی ڕەبـەق لـە سـەرگەت و هانـەی دنـدا بـە مامۆستایی ژیانت بردە سـەر .. لـە ساڵی (١٩٧٩) وە مامۆستای وانـەی كوردیـت .. لـە زاراوە و وشـەی دێهاتـەكانی هۆرامـان شـارەزابوویت .. دەمێكـە لەگـەڵ ئەدەبـدا دۆستایەتیت هەیە و خەڵك بە ((شاعیر)) نـاوت ئـەبات، جا ئەگـەر تـۆ فەرهـەنگێكی هۆرامی بە زەحمەت و گران بزانیت و بە تۆ نەكرێ ئەی ئەبێ بۆ كێ سوك و ئاسان بێت؟ ئەبێ بە كێ بكرێت؟ بەم جۆرە هازە هازە و هانی خۆمم ئەدا و، هەر خۆم بـۆ خۆم وێرانم بۆخۆم ئەسازاند.

بـۆ خۆشـبەختی ، لـە (١٣-٨-٢٠٠١) ز، لـە هەڵەبجـەی تـازە بـڕاین و بـە ماڵـەوە هاتینەوە بۆ هەڵەبجەی شەهید. بە خۆمم گوت: كاكە! ئێستا دەر و دراوسێت، دەور و

بەرت بە زۆری هۆرامین، بۆ هەر وشەیەك دابمێنی ، ئەتوانی پەنایان پێ ببەیت و کارت بە ئاسانی بۆ جێ بەجێ ئەبێت. کەواتە هیچ لێی مەوەستە ، ناوی خوای لێ بێنە و دەست پێ بکە. ها!! نەکەی پەست و بێزار و ماندوو ببی .. هەناسە درێژ و کۆڵنەدەر بە .. وزە بەرز و ماندوویەتی نەناس بە .. ئەرێ، هیچ بناغەیەکی هۆرامی بۆ دامەزارندنی ئەم کۆشکە لە بەردەستدا نی یە! ئەمەش زەحمەتەکە سەخت تر ئەکاتەوە.

بە خۆمم ئەگوتەوە: دەی ئەوە ((ئەستێرە گەشە)) ی ((فاضل نظام الدین)) . و ئەوە ((فەرهەنگێکی خاڵ)) و ئەوەش ((هەنبانە بۆرینە)) کەی ((م. هەژار)) . لەسەر شێوەی ئەوان و، هەوڵ و بیر و بۆچوونی خۆیشت بناغە دارێژە و پایەی لەسەر دابمەزرێنە، لە خۆت حەرەکەت و لە خوایش بەرەکەت.

لە ڕۆژی (١١-١-٢٠٠٢) دا، ناوی خوام لێ هێنا و لە یەکەم پیتەوە دەستم پێ کرد. شەوم خستە سەر ڕۆژ و ماندوویەتیم خستە ئەو لاوە، لە پرسیار کردن و بەدوادا چوونا، لە گەڕان و پشکنین و لێکۆڵینەوەدا، نە سڵم ئەکردەوە و نە شەرمم ئەکرد. لەگەڵ ئەو هەموو ماندوو بوونەمدا، هەستم بە خۆشیی و بەختیاریی و نەشەی سەرکەوتن دەکرد، بەبێ ئەوەی کەسێك دەستەیەك وشەم بۆ بێنێ، بەبێ ئەوەی کەسێك یەك لاپەڕە بنووسێتەوە، گەیشتم بە ئاواتی خۆم. چی بکەم لەو دۆستانەی چەند جارێك داوای کۆمەکم لێ کردن و تاکە وشەیەکیان بۆنەهێنام! بەڵام سەد ڕەحمەت لە گۆڕی ئەو پێشینانە کە گوتوویانە:((کەڵەشێریش نەخوێنێ ڕۆژ هەر ئەبێتەوە)) .ئەرێ، نەکەڵەشێر و نەفرۆج هیچ کامیان نەیان خوێند و بە کۆمەکی خوا ڕۆژیش بوویەوە و کاری کاردارانیش مەیسەر و جێ بەجێ بوو . سوپاس بۆ خودای فریاد ڕەس.

**هەرچیم گەرەك بۆ جە تۆم گەرەکا     ئەر جە تۆ نەبۆ نامو بەرەکا**

زۆرن ئەوانەی کە لەم دونیایەدا بە دڵسۆزانە و بێ وچان ڕەنج دەدەن، بەڵام لەبەر بێ دەستیی و بێ کەسیی کەس پێیان نازانرێت و ڕەنجیان نادیارە و ناویان دەسڕێتەوە.

من یەکێك بووم لەوانە! لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی ڕابردووەوە خۆم هاوێشتە دنیای نوسینەوە، بەرهەمێکی فرەی هەمەجۆرم پێکەوە ناوە و زۆریش دڵم پێی

خۆشـە، بـەڵام داخەکـەم بـەهۆی بـێ دەسـتی و بـێ کەسـی یـەوە تـەپ و تـۆزی دنیـا بەرهەمەکەم و تـەپ و تـۆزی خـەم و پـەژارە دڵمـی داپۆشـی بـوو، لەگـەڵ بێهیواییـدا دەستە و یەخە وەستابووم.

لەم کاتـەدا سـەرۆکایەتیی ئـەکادیمیای کـوردیی – بەتایبـەتی سـەرۆکی ئـەکادیمیا بەڕێز دکتـۆر شـەفیق قـەزاز و بـەڕێز دکتـۆر ئـازاد ئەحمـەد – بـە گـەورەیی خۆیـان بەسـەریان کردمـەوە و پەیوەنـدیان پێـوە کـردم و بڕێـك لـە بەرهەمـەکانیان بـینی، دواجـار بڕیاریـان دا کـە بەرهەمـە هـۆرامی یـەکانم بـۆ چـاپ بکـەن لەسـەر ئـەرکی ئەکادیمیای کوردی. و ئەم وشەنامەیە یەکەمین بەرهەمە کە بۆم چاپ بکـەن. جێـی خۆیــەتیی منــیش بــە گــەرمی سووپاســیان بکــەم و پێــزانینی خــۆم دەربــڕم بــۆ سـەرۆکایەتیی ئـەکادیمیای کـوردی. هیـوادارم سـەربەرز و بـەردەوام بـن لـە خزمـەت کردن بە دنیای نوسینی کوردی و دەست گرتنی ئەوانەی لەم بوارەدا بێ دەست و بێ کەسن.

## زمان و وشەی بێگانە

باوەڕم وایە لەم دنیایەدا، بە تایبـەتی لـە سـەدەی بیـستەمدا و بەتایبـەتی تـر لـە ئەمڕۆدا، زمانێك نی یە کە وشەی بێگانەی تێدا نەبێت و تێی نـەخزێت. جا بۆیـە منیش دەنگم دەخەمە پاڵ ئەو ڕایە کە دەڵێت: ((وشەی بێگانە ئەگەر وای لـێ هـات بە کون و قوژبنی وەڵاتدا بڵاو بـۆوە، خوێنـدەوار و نەخوێنـدەواری گـەل توانیـان لـە جێی خۆیا ڕۆژانە بـە ئاسایی بـە کـاری بهێـنن، ئـیتر کـاڵای بێگانەیـەتی لـەو وشـەیە دادەماڵرێت و، ئەبێتە مـوڵکی ئـەو میللەتـە و نابێـت بـە بێگانـە و بـە نـامۆ تەماشـا بکرێت و، دروست نی یە هەوڵی نەهێشتن و سڕینەوەی بدرێت ، چونکە بـەوە زیـان لە خۆ دەدرێت و هیچ زەرەرێك بە بێگانەکە ناگات).

گەلی کورد بە گشتی و هەر لە کۆنەوە ، تێکەڵاویی جۆربەجۆری لەگەڵ تـورك و فارس و عەرەبدا هەبووە، زیاترلە ( ١٤٠٠ ) ساڵە لەگەڵ عەرەبـدا دەژی، هاوخـەبات و هاوتێکۆشان بوون.. باوەڕیان بەیەك کتێبی ئاسمانی هەیە کە ((قورئـان)) ی پـیرۆزە، ئەویش بە زمـانی عـەرەبی . دیـارە ئەمـەش وەهـای کـردووە کـە وشـە لـە نێوانیانـدا ئەمبەر و ئەو بەر بکات و لە هەر دوو لادا ڕیشە دابکوتێت. دەی ئەو وشانە بوونەتە

موڵکی ئەو گەلەش کە ڕۆژانە بەکاریان ئەهێنێ. بەلای منەوە، هەوڵدان بۆ سڕینەوە و دەر کردن و بە گۆڕکردنی ئەو وشانە، بە ناوی بژار کردن و پاك کردنەوەی زمانی نەتەوایەتی یەوە، زەرەرێکی لەو گەل و میللەتە دەدرێت. هەر بێژە و وشە و زاراوەیەك، کە سەرجەم خەڵکی هۆرامان، بە ئاسانی و سانایی بە کاری ئەهێنێ و ڕۆژانە بەسەر زاریەوەن، من ئەو وشە و بێژە و زاراوەیە بە هۆرامی دائەنێم و لەم فەرهەنگەدا جێی ئەکەمەوە، ئیتر ئەو وشەیە لە بنەڕەتا با بێگانەش بێت.

بەلای منەوە زمان خۆشەویستە.. شیرینە.. بەرزە.. پیرۆزە.. بەلای منەوە خۆشویستن و پارێزگاری کردنی زمان، بەرگری لێ کردن و خزمەت کردنی، بژارکردن و پاك کردنەوەی، پەرەپێدان و فراوان کردن و بەرەو پێشەوە بردنی، ئەوەندە بەرز و پیرۆزە، وەك (( واجب))، بەڵکو هەر بە(( واجب)) سەیری دەکەم، هەر ئەو هەستەش ئەو هەموو ئەرکەی داوە بەسەرما، کە چەند ساڵێك لە تەمەنی شیرینی خۆم بە خۆشحاڵی یەوە ببەخشم بە زمانەکەم .. هەر ئەو هەستەش وای لێ کردووم کە چێژ لە شەونخونی و لە ماندوویەتی وەربگرم.

خزمەت کردنی زمان، پێویستی بە ژیری و ئارامی.. بە لێزانی و وەستایەیتی .. بە هەست و دڵسۆزیی .. بە کارکردن و کرانەوە هەیە، بەڵێ، دەبێ هەمیشە زمان بەرەو فراوانی و قوڵی و پاکی و پاڵفتەیی ببرێت، ئەبی لەگەڵ ڕەوڕەوەی پێشکەوتنا ئاراستە بکرێت و هەنگاو هەڵبگیرێت، دەبێ هەوڵ بدرێت وشە کۆنە ڕەسەنەکان نوێ و زیندوو بکرێنەوە، بە پێی پێویست و توانا و لەسەر بنەڕەت و ڕێزمانی زمانەکە وشەی نوێ دروست بکرێت و دابتاشرێت، ئەگەر هەر چار نەبوو و زەروورەتیش داوای کرد، ئەوسا ئەکرێت وشەی بێگانە بخوازرێت. دیارە بێگانەش هەر کەسێك ببێ هەر بێگانەیە.

لەگەڵ ئەوەدا کە لەگەل ئەم فەرهەنگەدا تەواو ماندوو بووم .. لە شەش جار زیاتر .. خۆم بە تاك و تەنیا .. بە دەست خەتی خۆم نووسیومەتەوە ، تەرتیبی ((هیجائی)) وشەکان ئەو پەڕی ئەزیەتی داوم .. تەنانەت شەوانیش لە خەودا مێشکم هەمان باس و هەمان شریتی لێ ئەدایەوە و ماندوویەتیی ڕایدەچڵەکاندم .. لەگەڵ ئەوەشدا کە کارەکەم کارێکی داهێنان (إبداعی) ە، چونکە لەم ڕووەوە کەس پێشم نەکەوتووە و ئەم فەرهەنگە یەکەمین فەرهەنگی شێوە زمانی هۆرامی یە ..

هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر زۆرم خۆش دەوێت و شانازی پێوە دەکەم .. لەگەڵ ئەو شتانە و چەندین شتی تریشدا، گەڕام بۆ سادەترین و ڕۆح سووك (متواضع) ترین ناو بۆی . دواجار - بە بیری خۆم - ڕێم لێی کەوت و ناوم نا ((**ۋەرقوڵ**))، واتە ((**بەرکوڵ**)) .

من ناڵێم ((**ۋەرقوڵ**)) تێر و تەواو و بێ گەردە، ئەکرێت چەندان وشەی لە یاد چووبێت .. ئەکرێ شتانێکی لە خۆ گرتبێ کە ((وتە)) نەبن .. ئەکرێ جار بەجارێ لە ڕووی تەرتیبی هیجائی وشەکانەوە پێش و پاش ڕووی دابێ. ئەبێ ئەوەش بڵێم کە: زار یان زمانی هۆرامی لەوەی کە من نووسیومە، فراوانتر و قوڵ ترە و من هەر ئەمەندەم لێ هەڵکڕاندووە . لە لایەکی ترەوە ئەم فەرهەنگەی من لە بازنەی شێوەزاری هۆرامی ئەم دیو - هۆرامانی عێراق - نە ترازاوە و دەستی بۆ وشەی هۆرامانی ئەودیو - هۆرامانی ئێران -  بەدەگمەن نەبێت نەبردووە، بە هیوای ئەوەی کەسێك لە ڕۆڵەکانی ئەوێ، ڕۆژێك لە ڕۆژان بەو کارە پیرۆزە هەڵسێت.

لێرەدا ئەبێ ئەوەش بگوترێت، کە ئەم فەرهەنگە دەستی بۆ کار ( فعل) نەبردووە. ئەگەر  وشەگەلێك بینران و خوێنەر پەنجەی بۆ کێشان و گوتی: ((ووشەکانی وەك: لۆای، ئامای، شی یەی، مەرڎەی و .. هتد. فرمانی ڕابردوون و بکەرەکەشیان کەسی دووەمی تاکە و ((ی)) یەکەی کۆتایی ڕاناوی لکاوە)) . لە وەڵاما پێی دەڵێم: ئەوەی کە تۆ دەیڵێی ڕاستە . بەڵام من لێرەدا وەکو چاوگ هێناومن و چاوگیشن، ئەو ((ی)) ەش کە دەبینرێت ، ئەوە ((ی)) ی چاوگە نەك جێناوی تاکی کەسی دووەم.

شتێکی تری زۆر گرنگ و ڕۆشن لە ((**ۋەرقوڵ**)) دا دەبینرێت، کەوا لە فەرهەنگە کوردی یەکانی تردا یان بوونی هەر نی یە، یان نابینرێت ، ئەویش باس و باتووری ڕەگەز (جنس) ی نێر و مێ یە. ڕەگەز لە هۆرامی دا زۆر بە ڕوونی و بە نیشانەی ئاشکراوە دەر ئەکەوێ. هەر شتێ بگریت لە هۆرامیدا، جنسەکەی یان نێرە یان مێ. بۆ دەرخستن و نیشاندانی ئەم ڕاستی یە زانستی یە ، من هاتووم ڕەگەزە نێرەکەم کردووە بە بناغە و پێشم خستووە، بە دوای ئەودا نیشانەی لێکدان (×) م داناوە و بەدوای ئەویشدا مێینەکە- کە لە هەمان وشە یان بێژەوە - هاتووە . وەك : ((درێژ × درێژە، باریك × باریکە، کرێکار × کرێکارە، نانەۋا × نانەۋێ و ... هتد)).

چاوگ - وەك من بزانم - لە زارەكانی تری كوردیدا یەك شێوە (صیغە) ی هەیـە، كەچی لە زاری هۆرامیدا - بەتایبەتی چاوگی دارێژراو و لێكدراو - دوو تا سێ شێوەی هەیـە واتاكەشـی هـەر هـەمان واتایـە. بـۆ نمونـە : (دارشـتن ، تـێ كـردن ) بـەم دوو شێوەیە دادەرێژرێن: ((ئەرەمتەی، ئەنە كەرڤەی))، ((متەیرە/ متەیەرە، كەرڤەینە / كەرڤەیەنە)). نموونەش بۆ ئەو چاوگە لێكدراوانەی كە دووبارە بوونـەوە و دووبـارە كردنەوە دەگەیەنن . وەك: (( پاك بوونەوە، پاك كردنەوە ) بەم سێ شێوەیە ئـەنجام دەدرێن:

١- ((پاك ئەۋە یی یەی ، پاك ئەۋە كەرڤەی )).

٢- ((پاك بی یەیۆ، پاك كەرڤەیۆ)).

٣- ((پاكۆ بی یەی ، پاكۆ كەرڤەی)).

دیاردەیـەكی تـری زۆر لەبەرچـاوی ئـەم زارە ئەمەیـە هـەموو شـتێك بـچووك كـراوە (تـصغیر) ی هەیـە، گـەورەترین گـەورە هـەتا بـچووكترین بـچووك، پابەنـد و گەردنكەچـی ئـەم یاسـایەیە. بـەڵام مـن ناچـار نـەبووبم، دەسـتم بـۆ ئـەو دیاردەیـە نەبردووە ، هەتا قەبارەی فەرهەنگەكە زۆر قەبە نەبێت و لـە قەبارەیـەكی بـچووكدا بمێنێتەوە. بە كوردی و بە كورتی : هەوڵم داوە كە كورت دادرِێم نەك درێژ دادرِ. من ((**ۋەرقوڵ**)) م كردووە و ژەمەسەرەكی یەكەم هێشتوەتەوە بۆ كەسانی دوای خۆم .

## چەند سەرنجێك

داوا لە خوێنەری هێژای ئەم فەرهەنگە ئەكەم، لە پێش خوێندنەوەیدا، بەوردیی ئەم چەند سەرنجە بخوێنێتەوە و چاك چاكیش لێیان تێ بگات:

١ - من نەم گوتووە و هەرگیز ناشڵێم كە شێوەزمان یان زاری یاخۆ زمانی هۆرامی هەر لە سەرەتاوە تا ئەمرِۆ ، بەم شێوەیەی ئێستا بووە كـەمن نووسـیومەتەوە. بـەڵام ئـەڵێم بـە بـیرەوەری مـن تـا ئـەمرِۆ، خـەڵكی هۆرامـانی عـیراق بـەم شـێوەیە دواوە و دەدوێ

٢ - هەردوو وشەیەك كە نیشانەی (×) یان لە نێواندا هەیە، ئەوە وشەكەی دەستە ڕاستیان نێر و ئەوەی دەستە چەپیان مێ یە، ئیتر ڕەگەزەكە حەقیقی بێت یان مەجازی .. ماددی بێت یان مەعنەوی.

٣ - ئەم فەرهەنگە كار (فعل) ی تێدا تۆمار نەكراوە، هەروەها بە دەگمەن و لەبەر زەرورەت نەبێ، ناوی تایبەتیشی نەگرتووەتە خۆ.

٤ - گەلێ وشە هەن كە تایبەتن بە مەحاڵی هۆرامان و میللەتی هۆرامانەوە، هاو واتایان لە سۆرانیدا نی یە، ئەمەش ناچاری كردووم كە بە شەرحێكی زۆر كورت و خەست دەریان ببڕم.

٥ - هەندێ پیت هەن لەهۆرامیدا، كە وەك پاشگر ئەلكێن بە ناوێكەوە، ئەو كاتە واتای وشەیەك یان پێشگر و پاشگرێك دەبەخشن. ئەمە لە سۆرانیدا وێنەی نی یە. وەك: ((ۆ)) كە دەچێتە سەر دەیان وشەی وەك: سەر، بان، پار، شار، هەڵەبجە و ... هتد و دەبێ بە ((سەرۆ: لەسەرەوە / بە سەرەوە .. بانۆ: لە بانەوە .. بە بانەوە .. شارۆ: لە شارەوە / لە شارەوە .. هەڵەبجۆ: لە هەڵەبجەوە / بە هەڵەبجەوە . شتانی تری وەك : ((ۆری، ەرە، ەنە)) شمان لەو جۆرە هەیە.

٦ - ئەم فەرهەنگە، دوورنی یە هەموو شێوە زمانی هۆرامی یان هەمووی هۆرامی نەبێت. واتە، ئەكرێت گەلێ وشە لە یاد كرابێت و گەلێ وشەی نا هۆرامی تێ ئاخنرابێت .

٧ - كاتی خۆی بەڵێنم دابوو كە پاشكۆیەك بۆ ((**ۆەرقوڵ**)) بنووسم بە ناوی ((**شارۆ و ۆەرقوڵی**)). سوپاس بۆ خوا، شارۆم كرد و پاشكۆكەشم نووسی، دوای ئەوە لەگەڵ ((ۆەرقوڵدا)) تێهەڵكێشم كرد و ئەم فەرهەنگەیان پێك هێنا.

٨ - لەوانەیە كەسێك بپرسێت: ئەم فەرهەنگە بۆچی ((**هۆرامی** / **سۆرانی** ))ە و، بۆچی هۆرامی و شێوەزارێكی تر نەبێ؟ لە وەڵاما ئەڵێم : ئەگەر بە هۆرامی و شێوەزارێكی تر بووایە ، ئەو كاتە ئەوترا : ئەی بۆچی هۆرامی / سۆرانی نەبێت؟

## شێوە زاری هۆرامی و سۆرانی

هەر كەسێك هەردوو شێوە زارەكە (هۆرامی و سۆرانی) بە باشی بزانێت و بەشێك لە زانستی زمان شارەزا بێت و، بە چاوی دیراسە و لێكۆڵینەوەوە بۆیان

بڕوانێت و سووکەڵە بەراوردێکیان بکات، من وای بۆ دەچم کە سێ بیرۆکە، یاخۆ سێ بۆچوونی لەلا دروست دەبێ، ئەو کەسە خۆیشی نازانێ کام لەو سێ بیرە، یان سێ بۆچوونە لە دوانەکەی تر ڕاست تر و بەجێ ترە. ئەو سێ بیرۆکە و بۆچوونەش ئەمانەن:

١ - کاتێ کە ئەبینێ لە هەردو زارەکەدا، دەیان و هەزاران وشە کوت و مت هەر یەکن - نەك وەك یەك - یەکسەر ئەڵێ : هەردوو زارەکە هەر یەك زارن، یەك شتن . ئەها سەیری ئەم وشانەی هەردوو لا بکە: دەم: دەم، قاچ: قاچ، نان: نان، ئاسمان: ئاسمان، هەوا: هەوا، ڕەق: ڕەق، نەرم: نەرم، پیاڵە: پیاڵە، ساج: ساج ... هتد.

٢ - لە کاتێکا کە دەیان و سەدان وشە ئەبینی لە هەردوو زارەکەدا، کە لە یەکەوە هەر زۆر نزیکن و جیاوازی یەکی ئێجگار کەم لە نێوانیاندا هەیە ، ئیتر یەکسەر دەڵێیت: هەردووکیان دوو لقی نزیك بە یەکی یەك درەختن ، بەڵام جێگە و درێژبوونەوەی ڕۆژگار هەندێ جیاوازی هێناوەتە نێوانیان. بەڵگەش بۆ ئەم بۆچوونە، سەدان و هەزاران وشەی لەم جۆرەیە: ئاو: ئاوی، سەر: سەرە، سەرین: سەرەنگا، شەو: شەوە، ڕۆژ: ڕۆ، دەستەڵات: دەسەڵات، با بردوو: وا بەرڤە، مردوو، مەرڤە ... هتد.

٣ - بەڵام کاتێك کە دەگەیت بە هەزاران وشەی وەها ، کە نە قەد و نە ڕەگ و نە چاوگیان لە یەك ناچێت و، بۆن و شێوە و لەرە و ئاهەنگ و مۆسیقایان بە قەدەر دووری نێوان ئاسمان و زەوی یە، ئەوسا لە بەردەم ئەم ڕاستی و واقیعەدا، ناچار ئەبێت بەبێ ڕووپامایی بڵێیت: ((هەورامی و سۆرانی، باوکیان نەك هەر لە مزگەوتێکدا، بەڵکو لە وەڵاتێکیشدا پێکەوە نوێژێکیان نەکردووە))، وەرە تەماشای ئەم وشانە - هەر بۆ نموونە - بکە ، بزانە چەندێ لێکتر جیاواز و لە یەکەوە دوورن: کەو: ژەرەژی، گورچیلە: وڵك، کوڵان: گریای، ئانیشك : هەرەژنە، قەزوان: وەنی، کراس: گجی، ئەسپێ: هەشپشی، خانوو: یانە ..... هتد.

ئەم بڕیاردان و بڕیار کاریی یە کاری من نی یە. کارێکی لەم جۆرە پیاوی تایبەتی خۆی ئەوێ، مێژوو و بەڵگەی مێژوویی دەوێ، توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی گەرەکە، بەڵگەی زیندوو و زانستی یانە دەخوازێ، کارێکی ساف و سۆڵ و ئاسان نی یە. کاری منیش لێرەدا دانانی فەرهەنگێکە و بەس.

من هەر ئەوەندە دەتوانم کە بڵێم: هۆرامی و سۆرانی لە لایەنی جوگرافیی و سوکنابوونەوە لە یەکترەوە زۆر نزیکن، مامەڵە و تێگەڵاویی و هەڵسو کەوتیان پێکەوە زۆر و دێرین و گەرم و گوڕە، ئەم ڕەگەزانەش بە درێژایی مێژووی پێکەوە بوونیان، دیارە کاری سروشتی و ڕەنگدانەوەی کاریگەرییان هەبووە لەسەر هەردوولا.

## پیتەکانی زاری هۆرامی

پیتەکانی نووسینی ئەم فەرهەنگە ، هەر ئەو پیتانەن کە سەدان ساڵە لە ناوماندا باون و، زمانی کوردییان لە عیراقدا پێ دەنووسرێت. ئەم پیتانە لە ناوماندا بە ((ئەلف و با)) ی عەرەبی ناسراون، کە عەرەبیش وەك میراتیی لە ئارامی یەکانەوە بۆیان بەجێ ماون. ئەو پیتانەی کە تاکو ئێستا زمانی کوردییمان پێ نووسیونەتەوە، ئەم بیست و حەوت پیتەن: ((ئ، ب، پ، ت، ج، چ، ح، خ، د، ر، ز، ژ، س، ش، ع، غ، ف، ق، ڤ، گ، ك، ل، م، ن، و، ه، ی)). دیارە هەر یەکە لە ((ر، ل)) دوو جۆری هەیە کە باریك و قەڵەوە .. هەروەها هەریەکە لە ((و ، ی)) سێ جۆری هەیە: ((و، ۆ، وو .. ێ، ی، یی)) .

بەڕای من ئەم پیتانە لە بارن بۆ نووسینی زاری هۆرامی، دەتوانن لە سەدا نەوەد و نۆی زمانی کوردی – بە گشتی - بنووسن. ئەوەندە هەیە، زۆربی سەر و بۆر و ژێرە و زۆریی ددانەکانی ((س، ش)) و، زۆریی ژمارەی خاڵەکانی هەندێ لەو پیتانە، کاری زوو نوسین بۆ نووسەر شێنەیی ئەکات و دوای ئەخات .

بۆ نووسینی زاری هۆرامی بەو پیتانە، پێوسیتمان بەم چوار شێوە پیتەی تر هەیە:

١ - پیتی ((ذ)) کە پیتی ((دال)) ە وسێ خاڵی ئەخرێتە سەر. دەنگی ئەم پیتە لە زارەکانی تردا نی یە، تەنها و تەنها هۆرامی زانێکی کارامە ئەتوانێت وەك خۆی دەری ببڕێت، هەر وەك چۆن پیتی ((ج)) تەنها عەرەب یان عەرەبی زانێکی کارامە دەتوانێ دەری ببڕێ. پیتی ((ذ)) پیتێکی نەبزوێنە و هەمیشە ئەکەوێتە سەرەتا یان کۆتایی بڕگەوە . وەك: دذان، مەکذان، چەنذان، بەهرەمەنذ، دڵشاذ، مراذ ... هتد)).

٢ - پیتی (( ۆ)) ، كه ((واو)) یّكه و هەشتیّكی بچووكی بەسەرەوە ئەكریّت. ئەم پیتە دەنگی ((ڤ)) ی لیّ ئەبیستریّت، نابیّتە بزویّن ، ئەكەویّتە سەرەتا و كۆتایی بڕگەوە، بڕوام وایە لە بنەڕەتا ((ڤ)) بووبیّت و گۆڕانی بەسەرا هاتبیّ . تەماشای ئەم وشانە بكە: ((ۆاران، ۆەرۆە، ۆیّرەگا، شەۆیْ، ئاۆی، گاۆ، نۆباۆ، گولاّۆ، پلاّۆ ..... هتد)).

٣ - پیتی (( ۆ)) كە پیتی ((واو)) ە و زەنە (سكون) یّكی بچكۆلانەی بەسەرەوە ئەكریّت. دەنگی ئەم پیتە ئەكەویّتە نیّوان دەنگی ئەم دوو واوەوە ((و، ۆ)). پیتیّكی بزویّنە و هەرگیز ناكەویّتە سەرەتای بڕگەوە . سەرنج لەم وشانە بدە: ((برۆ، مرۆ، دۆ، كۆ، ڕۆڵە، تۆپە، كرۆڵ، دهۆڵ، ماسۆڵكە، زەنگۆڵ ... هتد )) .

٤ - پیتی ((یْ))، كە ((ی)) یەكی نیمچە كراوە یە و بازنەیەكی بچووكی ئەخریّتە سەر. ئەكەویّتە نیّوان دەنگی ((ی)) و ((یْ)). هەرگیز لە سەرەتای بڕگەوە نایەت، دەكەویّتە ناوەڕاست یان كۆتایی بڕگەوە، چونكە بزویّنە . وەك: ((تیْر، سیْر، دلیْنە، شەۆیْ، پیْۆە، كناچیْ، كوولەكیْ، مووریْ، كیْلاّنیْ ... هتد)) . هەروەها دەبیّتە نیشانەی سەرەكیی كۆ لە زاری هۆرامییدا. بۆ نموونە : زاڕۆڵیْ : منالاّن ، كوڕیْ : كوڕان، كناچیْ: كچان، بزیْ: بزنان، تەۆەنیْ: بەردان، ساۆیْ: سیّوان ... هتد .

ئەو نیشانانەی كە دەخریّنە سەر (( ۆ، ۆ، یْ )) داهیّنانی منە و هیچ كەس پیّشم نەكەوتووە، ئەكریّت بلّیّم كە كەشف كردنی ئەو سیّ پیتە كاری من بوو. بەلاّم كەشف كردن و نیشانە دانان چ وەك سیّ خالّ یان چ وەك هەشتیّك بۆ ((د)) و كردنی بە ((ڎ / ذ))، لە سەرەتای شەستەكانەوە سەری هەڵداوە. بەم جۆرە هەرگیز نابیّت و ناكریّت دەست بەرداری ئەو چوار شیّوە پیتە ببین، چونكە زاری هۆرامی بەبیّ ئەوانە هەرگیز وەكو خۆی نانوسریّت. ئەو كەسانەش كە ((ۆ)) بە ((ۆ)) و ((یْ)) بە ((یْ)) دەنووسن، تەواو هەڵەن و ئەوەی دەینووسن هەڵەیە و شتانی جۆر بە جۆر تیّكەڵ بە یەكتر ئەكەن .

لە كۆتایی ئەم پیّشەكی و باسانەدا، بە ویّرانەوە ئەتوانم بلّیّم: زمان یان زاری هۆرامی، خۆی بۆ خۆی دەریایەكی فراوانی قووڵی پڕ لە مرواریی یە. كەسانی مەلەوانی زانا و دڵسۆز و دەست پاك و لیّ بڕاو و ماندوو نەناسی ئەویّت، هەتا ئەو مرواریانە لە بنی ئەو دەریایەدا دەر بیّنن و، لە پیشانگادا بینەران و شەیدایان و

کڕیارانیان لێ کۆ بکەنەوە. مەر هەر ئەو کاتە گرنگیی و مەزنایەتی زاری هۆرامی وەك خۆی دەر بکەوێت .

داخەکەم ! ئەم زارە دەیان ساڵە کەساس و بێ ناز و هەتیو و بێ کەس کەوتووە .. خراوەتە لاوە و پشت گوێ خراوە .. پەردەی ڕەشی فەرامۆشی بەسەر ڕوخسار و ناوەڕۆکە بەهادار و قەشنگەکەیدا کێشراوە .. لەگەڵ ئەوەشدا بە هۆی گوڕ و تینی خۆیەوە، هەر بە زیندوویەتی و تەڕ و پاراوی ماوەتەوە و، سیفات و تایبەتمەندیی یەکانی خۆی بە ئەمانەتەوە هێشتووەتەوە .

من لەم کۆتایی یەی تەمەنمەوە، وەك ڕۆڵەیەکی ئەم زارە، هەستم بزواوە و کەللەم هاتۆتە جۆش، شەیدایی و ئەوینی مەلە کردنی نێو ئەم دەریایە، سەراپای داگیر کردووم. نیاز و ئارەزوو و ئاواتم ئەمەیە، ئەوەی سەبارەت بەم زارە ئەیزانم و ئەیتوانم، دریغی نەکەم و ئەنجامی بدەم. تا ئەو ڕۆژەی کە دڵم لە لێدان ئەکەوێت، بە دڵسۆزانە خزمەتی بکەم. بەڕاستی زمانەکەم وەك شاخەکانی هۆرامان بڵندە .. وەك گوڵ و گوڵاڵە و دار و درەختەکانی ڕەنگین و بۆن خۆشە .. هەروەك کانیاو و تاڤگەکانی زوڵاڵە .. قووڵی و فراوانی یەکەشی، لەقووڵایی و فراوانی بیر و مێشك و خەیاڵی میللەتی هۆرامانەوە سەرچاوەی گرتووە .

**جمال حبيب الله فرج ((بێدار))**

**هەڵە بجەی شەهید** .

٢٤ / **شوباتی** / ٢٠٠٦ ز **بەرامبەر** ٢٥ / **موحەڕڕەمی** / ١٤٢٧ ك .



# پیتی ئیْ (ئـ)

**ئـ:** یەکەمین پیتی زمانەکەمان. پیتێکە لە زاری نەخۆش لە کاتی نالاندنا دێتە دەر. پیتی گاڵتە پێ کردنە.

**ئـا:** ئـا. بـەڵێ. ئـەو. ئـەو. ئـامرازی پرسیار کردنــــە. سەرســـوڕمانە. ئـــامرازی ورياكردنـــــەوە و هاندانـــــە.ئـــامرازی نیشاندانە.

**ئائـا:** بـەڵێ بـەڵێ. ئـامرازی سەرسـوڕمانی زۆر.

**ئائانــــە ، ئائـــانیْ:** ئائـــەوە. ئـــەو كاتـــە. ئائەوانە.

**ئـــا ئوونـــە ، ئـــائونیْ:** ئائـــەوە، ئائەوانـــە. ئامرازی ئیشارەتە بۆ دوورتر.

**ئا ئی... ە ، ئا ئی...یْ:** ئەو... ە

**ئا ئینە ، ئا ئینیْ:** ئا ئەمە. ئا ئەمانە.

**ئاب:** ئاب. هەشتەمین مانگی زایینی.

**ئابا:** دا لاچۆ.نیشانم بدە.

**ئاباڎ:** باپیران.

**ئاباڎۆ:** لە باپیرانەوە.

**ئابـــاڎۆری:** لــە باپیرانـــدا لـــە خـــوارەوە بـــۆ سەرەوە.

**ئابـــاڎەرە:** لـــە باپیرانـــدا لـــە ســـەرەوە بـــۆ خوارەوە.

**ئاباڎەنە:** لەناو باپیراندا.

**ئابڵۆقە:** ئابڵۆقە.

**ئابڵۆقەدای:** ئابڵۆقەدان.

**ئابڵۆقە دریا ، ئابڵۆقە دریێ:** ئابڵۆقە دراو.

**ئابڵۆقە دریای:** ئابڵۆقە دران.

**ئابڵۆقە دەر ، ئابڵۆقە دەرە:** ئابڵۆقە دەر.

**ئابڵۆقەنە:** لە ئابڵۆقەدا.

**ئابووری:** ئابووری.

**ئابووری زان ، ئابووری زانە:** ئابووری زان.

**ئابووری زانی:** زانستی ئابووری زانی.

**ئابووری زانیەنە:** لە ئابووری زانیندا.

**ئابووری یەرە:** بەسەر ئابووریدا.

**ئابوونە:** ئابوونە.

**ئابوونەدای:** ئابوونەدان.

**ئابوونەدەر؛** ئابوونەدەرە. ئابوونەدەر.

**ئاتـاج ، ئاتـاجە:** ئاتاج. نەدارا و داماو.

**ئاتـاج بی یە ، ئاتـابیێ:** ئاتاج بۆ بووگ.

**ئاتـاج بی یەی:** ئاتاج بوون.

**ئاتـاج بی یەیۆ:** ئاتاج بوونەوە.

**ئاتـاج بی یەیەنە:** لە ئاتاج بووندا.

**ئاتاج کەرڎەی:** ئاتاج کردن.

**ئاتاج کەرڎەیەنە:** لە ئاتاج کردندا.

**ئاتاجی:** ئاتاجی. نەداریی و داماویی.

**ئاتاجیێنە:** لە ئاتاجییدا.

**ئاتەش:** ئاتەش. ئاگر.

**ئاتەشپرس ، ئاتەشپرسە:** ئاگر پەرست.

**ئاتەشپرسی:** ئاتەشپرسی. ئاگر پەرستی.

**ئاتەشپرسینە:** لە ئاگرپەرستیدا.

**ئاتەشخانە:** ئاتەشخانە.

**ئاتەش خانۆری:** بە ئەرتەشخانەدا بەرەو ژوور.

**ئاتەشخانەنە:** لە ئاتەشخانەدا.

**ئاتەشگا:** ئاتەشگا. جێگای ئاگری ئاگرپەرست.

**ئاتەشگانە:** لە ئاتەشگادا.

**ئاتەشی ، ئاتەشی یە:** تووورەی زوو هەڵچوو.

**ئاجوج و ماجوج:** یاجوج و ماجوج.

**ئاجیل:** ئاجیل. جۆرە چەرەسێکە.

**ئاجیلەنە:** لە ئاجیلدا.

**ئاچۆخ ، ئاچۆخە:** کراوە. والآ. ئاوەڵا. ئاچۆخ.

**ئاچۆخ بی یە ، ئاچۆخ بییێ:** ئاوەڵاکراو. ئاوەڵابووگ.

**ئاچۆخ بی یەی:** ئاچۆخ بوون.

**ئاچۆخ بی یەیەنە:** لە ئاچۆخ بووندا.

**ئاچۆخ کریای:** ئاچۆخ کران.

**ئاچۆخ کەرڎەی:** ئاچۆکردن.

**ئاچۆخ کەرڎەیەنە:** لە ئاچۆخ کردندا.

**ئاچۆخی:** ئاچۆخی.کراوەیی.

**ئاخ :** ئاخ.

**ئاخ ئازیز:** ناوی گۆرانی یەکی هۆرامی یە.

**ئاخ بڕ ، ئاخ بڕە:** ئاخ و ئاوات بڕ.

**ئاخ بڕیای :** ئاخ و ئاوات بڕان و هاتنە دی ئاوات.

**ئاخ بڕیەی :** ئاخ و ئاوات بڕیەی.

**ئاخر:** ئاخر.کۆتایی. دەی مەگەر. ئیتر.

**ئاخر ئارڎەی:** کۆتایی هێنان.

**ئاخر ئارڎەیەنە:** لە کۆتایی هێناندا.

**ئاخر ئامای:** کۆتایی هاتن.

**ئاخر ئامایەنە:** لە کۆتایی هاتندا.

**ئاخر ئاورڎەی :** کۆتایی هێنان.

**ئاخر ئاورڎەیەنە:** لە کۆتایی هێناندا.

**ئاخر خێر ، ئاخر خێرە:** ئاخر خێر.

**ئاخر خێری یەنە:** ئاخر لە خێرییدا.

**ئاخر خێری:** ئاخر خێریی. ئەنجام پاکیی.

**ئاخر زەمان :** ئاخر زەمان.

**ئاخرش :** ئاخری. ئەنجامی. لە دواییدا.

**ئاخر شەڕ ، ئاخر شەڕە:** ئاخر شەڕ.

**ئاخر شەڕ بی یە ، ئاخر شەڕ بییێ :** ئاخر شەڕ بووگ.

**ئاخر شەڕ بی یەی :** ئاخر شەڕبوون.

**ئاخر شەڕکەرژەی:** ئاخر شەڕکردن.

**ئاخر شەڕ کەرژەیەنە :** لە ئاخر شەڕکردندا.

**ئاخر شەڕی:** ئاخر شەڕی. ئەنجام خراپی.

**ئاخرۆ:** لە دواییدا.

**ئاخر و ئۆخر:** ئاخر و ئۆخر.

**ئاخرەمین ، ئاخرەمینە :** ئاخرەمین.

**ئاخزە :** ئاخزە جگەرە. قنگە جگەرە.

**ئاخ لاوە لاوە:** گۆرانی یەکی هۆرامی یە.

**ئاخۆ:** ئاخۆ.

**ئاخ و تف:** ئاخ و تف.

**ئاخ و داخ:** ئاخ وداخ. ئاە حەسرەت و خەم.

**ئاخۆم :** ئاخۆ. ئاخوا.

**ئــاخوون ، ئاخوونــە :** ئــاخوون. پێــشەوای ئایینی شیعە.

**ئاخوونەنە :** لە ناو ئاخووندا.

**ئاخ هۆرکێش ، ئاخ هۆرکێشە :** ئاخ هەڵکێش.

**ئاخ هۆرکێشای:** ئاخ هەڵکێشان.

**ئاخ هۆرکێشاینە :** لە ئاخ هەڵێکشاندا.

**ئاخ هۆر کێشتەی:** ئاخ هەڵکێشان.

**ئاخ هۆرکێشتەینە :** لە ئاخ هەڵکێشاندا.

**ئاخەنای:** ئاخنین.

**ئاخەناینە :** تێ ئاخنین.

**ئاخەنیا ، ئاخەنیێ:** ئاخنراو.

**ئاخەنیای:** ئاخنران.

**ئاخەنیایەنە :** تێ ئاخنران.

**ئاخەنیەی :** ئاخنین.

**ئاخەنیەیەنە :** لە ئاخنیندا.

**ئاخیرەت:** دواڕۆژ. قیامەت.

**ئاژ ، ئاژە:** ئەو.

**ئاژاب :** ئاداب. دەستوور و ئوسووڵ.

**ئاژابەنـــە :** لـــە ئادابـــدا.لـــە دەســـتوور و ئوسووڵدا.

**ئــاژا فــام ، ئــاژا فامــە :** ئوســووڵ زان. ئــاداب زان.

**ئاژافامی:** ئاداب فامی. ئوسووڵ زانی.

**ئاژا فامینە :** لە ئاداب فامیدا.

**ئاژەس :** ئەو بەر.

**ئاژەم :** ئادەم. باپیرەگەورەی ئادەمی.

**ئاژەمۆ:** لە ئادەمەوە.

**ئاژەمی ، ئاژەمی یە:** ئادەمی.

**ئاژەمیانە ، ئاژەمیانێ:** هەرچی کەوا شیاوی مرۆڤ بێت.

**ئاژەمیزاد :** ئادەمیزاد.

**ئادەی : ئادەی**. ووشەی هاندان و دەست پـێ کردن.

**ئاژێ :** ئەوان.

**ئاژیۆ:** لەووەوە.

**ئاژیۆری:** لەووەوە لە خوارەوە بۆ سەرەوە.

**ئاژیەرە:** لە ووەوە لە سەرەوە بۆ خوارەوە.

**ئاژیەنە ، ئاژێنە :** لە ئەوێدا.

**ئار:** ئاگر.

**ئارا :** ئارا. جێگا. وجوود.

**ئاراستە ، ئاراستێ :** ئاراستە.

**ئاراستە کریا ، ئاراستەکریێ:** ئاراستە کراو.

**ئاڕاستە کریای:** ئاڕاستە کران.

**ئاڕاستەکریایەنە:** لە ئاڕاستەکراندا.

**ئاڕاستەکەر ، ئاڕاستەکەرە:** ئاڕاستەکەر.

**ئاڕاستە کەرڎەی:** ئاڕاستەکردن.

**ئاڕاستەکەردەیەنە:** لە ئاڕاستەکەردندا.

**ئارام ، ئارامە:** ئارام.

**ئـــارام ئـــەوەبی یـــە ، ئـــارام ئـــەوەبیێ:** ئارامەوەبووگ.

**ئارام ئەوە بی یەی:** ئارامبوونەوە.

**ئـارام ئـەوە کریـا ، ئـارام ئـەوەکریێ :** ئـارام کراوە.

**ئارام ئەوە کریای:** ئارام کرانەوە.

**ئـارام ئـەوە کـەر ، ئـارام ئـەوە کـەرە:** ئـارام کەرەوە.

**ئارام ئەوە کەرڎەی :** ئارام کردنەوە.

**ئارام ئەوە کەرڎەیەنە:** لە ئارام کردنەوەدا.

**ئارام بڕیای:** ئارام بڕان.

**ئارام بڕیەی:** ئارام بڕین.

**ئارام بی یەی:** ئارام بوون.

**ئارام بی یەیۆ:** ئارام بوونەوە.

**ئارامگا:** ئارامگا. گۆڕ.

**ئارامگانە:** لە ئارامگادا.

**ئارام گرتەی :** ئارام گرتن.

**ئارامگرتەیەنە:** لە ئارامگرتندا.

**ئارامۆ بی یە ، ئارامۆ بیێ :** ئارامەوە بووگ.

**ئارامۆ بی یەی:** ئارام بوونەوە.

**ئارامۆ کریا ، ئارامۆ کریێ:** ئارامەوە کراو.

**ئارامۆ کریای :** ئارام کرانەوە.

**ئارامۆ کەر ، ئارامۆکەرە:** ئارام کەرەوە.

**ئارامۆ کەرڎەی :** ئارام کردنەوە.

**ئارامۆ کەردەیەنە:** لە ئارام کردنەوەدا.

**ئارام ۆنەبڕیای:** ئارام لێ بڕان.

**ئارام ۆنەبڕیەی:** ئارام لێ بڕین.

**ئارام ۆنە هۆر گێرتەی:** ئارام هەڵگرتن.

**ئارام ۆنە هۆر گێریای:** ئارام هەڵگیران.

**ئارام وەنە بڕیای:** ئارام لێ بڕان.

**ئارام وەنە بڕیەی:** ئارام لێ بڕین.

**ئارام وەنە هۆر گێرتەی:** ئارام هەڵگرتن.

**ئارام وەنە هۆرگێریای:** ئارام لێ هەڵگیران.

**ئارامی :** ئارامی.

**ئـــارامی بـــەخش ، ئـــارامی بەخـــشە:** ئـارامی بەخش.

**ئارامی بەخشای :** ئارامی بەخشین.

**ئارامی یەنە:** لە ئارامیدا.

**ئاراۆە :** ئاراو.

**ئاراۆەرە:** بە ئاراودا.

**ئاراۆەنە:** لە ئاراودا.

**ئارابیش :** ئارایش. ڕازاوەیی.

**ئارابیش دای:** ئارایش دان.

**ئارابیش دایەنە:** لە ئارایشدانا.

**ئـارابیش دریـا ، ئـارابیش دریـێ :** ئـارابیش دراو.

**ئارابیش دریای:** ئارایش دران.

**ئارابیش کاری :** ئارایش کاری. جوانکاریی.

**ئـاراییش کریـا ، ئـاراییش کریـێ:** ئـارایش کراو.

**ئاراییش کریای:** ئارایش کران.

**ئارایشکەر ، ئاراییشکەرە:** ئارایشکەر.

**ئاراییش کەرڎەی:** ئارایش کردن.

**ئارڎەی :** هێنان.

**ئارڎەیراوە:** داهێنانەوە.

**ئارڎەیرە:** داهێنان.

**ئارڎەیناوە:** هێنانەوە ناو بۆ جاری دووەم.

**ئارڎەینە :** داهێنان. ئیختیراع.

**ئارڎەیەنە :** داهێنان. ئیختیراع.

**ئارڎەیۆ:** هێنانەوە.

**ئارڎەیۆ بـاڵێ:** پەلە پێ کردنی زۆر.

**ئارڎەیۆگا :** هێنانەوە جێ.

**ئارڎەیۆما :** کەوچك تـێ ڕادان و پێگەیانـدنی چێشتی دۆکولێو.

**ئارڎەیۆ وێر :** وەبیر هێنانەوە.

**ئارڎەیۆ یاڎ :** هێنانەوە یاد.

**ئارڎەیەرە:** داهێنان.

**ئارڎەیەنە :** داهێنان (ئیختراع).

**ئارڎی:** ئارد.

**ئارڎین ، ئـارڎینە :** ئارداوی.

**ئارڎین بی یەی:** ئارداوی بوون.

**ئارڎین کریا ، ئارڎین کریێ:** ئارداوی کراو.

**ئارڎین کریای:** ئارداویی کران.

**ئارڎین کەرڎەی:** ئارداوی کردن.

**ئارڎیۆ :** بە ئاردەوە.

**ئارڎیەرە:** بە ئارددا.

**ئارڎیەنە :** لە ئارددا.

**ئارگا :** ئارگردان.

**ئارگانە :** لە ئاگرداندا.

**ئارۆ :** ئەمڕۆ.

**ئارۆ پۆلاوە:** ئەمڕۆ بە لاوە.

**ئارۆ پی لاوە:** لە ئەمڕۆ بەم لاوە.

**ئارۆ سوبحێ:** بەیانی ئەمڕۆ. ئەمڕۆ بەیانی.

**ئـار و مـوور ، ئـارو مـوورە:** مـورك و مایـە سەنگین.

**ئار و مووری:** سەنگینی و هێمنی مەردوم.

**ئارۆنە :** لە ئەمڕۆدا.

**ئارۆ و سەبای:** ئەمڕۆ و سبەینێ.

**ئارۆ و سەبای پنە کەرڎەی:** دەسـی دەسـی پـێ کردن.

**ئارۆ و سەبـای پەنە کەرڎەی:** دەسـی دەسـی پـێ کردن.

**ئارۆ و سەوای:** ئەمڕۆ و سبەی.

**ئارۆ و سەوای پنە کەرڎەی:** دەسـی دەسـی پـێ کردن.

**ئارۆ و سەوای پەنە کەرڎەی:** دەسـی دەسـی پـێ کردن.

**ئارۆوە:** لە ئەمڕۆوە.

**ئارۆوە دمای:** لەئەمڕۆ بە دواوە.

**ئارۆوە لای:** لە ئەمڕۆ بەو لاوە.

**ئارەزوو:** ئارەزوو.

**ئارەزوو بـاز ، ئـارەزوو بـازە:** ئارەزوو باز.

**ئارەزووبازی** : ئارەزووبازی. هەوەسبازی.

**ئارەزووبازینە** : لە ئارەزووبازیدا.

**ئارەزووبازیەنە** : لە ئارەزووبازیدا.

**ئارەزووکەرڎەی**: ئارەزووکردن.

**ئارەزووکەردەیەنە** : لە ئارەزووکردندا.

**ئارەزوومەنڎ** ، **ئارەزومەنڎە**: ئارەزوومەند.

**ئارەزوومەنڎی**: ئارەزوومەندی.

**ئارەزوومەنڎی یەنە** : لە ئارەزوومەندیدا.

**ئارەق**: ئارەق.

**ئارەقاوی** ، **ئارەقاویە** : ئارەقاوی.

**ئارەقخانە** : ئارەقخانە.

**ئارەق خانەنە** : لە ئارەقخانەدا.

**ئارەق بەردای**: ئارەق دەردان.

**ئارەق بەردایەنە** : لە ئارەق دەرداندا.

**ئارەق چنە** : تەقیلە. ئارەقگیر.

**ئارەق کەرڎەی**: ئارەق کردن.

**ئارەق کەرڎەینە** : لە ئارەق کردندا.

**ئارەق گرتەی**: ئارەق گرتن.

**ئارەق گرتەیەنە** : **لە** ئارەق گرتندا.

**ئارەق وارڎەی**: ئارەق خواردنەوە.

**ئارەق ۆرەش** ، **ئارەق ۆرەشە** : ئارەق فرۆش.

**ئارەق ۆرەشی**: پیشەی ئارەق فرۆشتن.

**ئارەق ۆرەشیۆ**: لە ئارەق فرۆشتنەوە.

**ئارەق ۆرەشی یەنە** : لە ئارەق فرۆشتندا.

**ئارەقین** ، **ئارەقینە** : ئارەقاوی.

**ئارەو** ، **ئارەوە**: عەرەب.

**ئارەوۆ** : لە عەرەبەوە.

**ئارەوی**: عەرەبی. زمانی عەرەبی.

**ئاری** ، **ئاریە** : ئاری.

**ئاریایی** ، **ئاریایی یە** : ئاریایی.

**ئازا** ، **ئازێ** : ئازا. خێرا. بە جەرگ.

**ئازا ئەۆە بی یەی**: ئازا بوونەوە.

**ئازا ئەۆە کەرڎەی**: ئازا کردنەوە.

**ئازا بی یە** ، **ئازێ بیێ**: ئازا بووگ.

**ئازا بی یەی**: ئازابوون. خێرابوون.

**ئازا بی یەیەنە** : لە ئازابووندا.

**ئازاڎ** ، **ئازاڎە** : ئازاد. سەربەخۆ.

**ئازاڎانە** ، **ئازاڎانێ** : ئازادانە.

**ئازادبی یە** ، **ئازادبیێ**: ئازاد بووگ.

**ئازاڎی یەی**: ئازاد بوون.

**ئازاد بی یەیۆ**: ئازاد بوونەوە.

**ئازاڎ بی یەیەنە** : لە ئازاد بووندا.

**ئازاڎ کریا** ، **ئازاڎ کریێ**: ئازاد کران.

**ئازاڎ کریای**: ئازاد کران.

**ئازاڎ کریایەنە** : لەئازاد کردندا.

**ئازاڎ کەر** ، **ئازاد کەرە**: ئازاد کەر.

**ئازاڎ کەرڎەی**: ئازاد کردن.

**ئازاڎ کەرڎەیۆ**: ئازاد کردنەوە.

**ئازاڎ کەرڎەیەنە** : لە ئازادکردندا.

**ئازاڎی**: ئازادی.

**ئازاڎ یخوا** ، **ئازاڎ یخوێ** : ئازادیخوا.

**ئازاڎ یخواه** ، **ئازاڎ یخواهە** : ئازادیخواه.

**ئازاڤیخواهی:** ئازادیخواهی.

**ئازاڤیخوایی:** ئازادیخوایی.

**ئازاڤیۆ:** بە ئازادی یەوە.

**ئازاڤی یەنە:** لە ئازادیدا.

**ئازار :** مانگی ئازار.

**ئازار دای:** ئازار دان.

**ئازار دریا ، ئازار دریێ:** ئازار دراو.

**ئازار دریای :** ئازار دران.

**ئازار دریایەنە:** لە ئازار دراندا.

**ئازار دەر ، ئازار دەرە:** ئازار دەر.

**ئازارۆ:** لە مانگی ئازارەوە.

**ئازارە:** ئازار. ئێش. دەرد.

**ئازا کەرڤەی :** ئازا کردن. پەلەکردن.

**ئازایانە:** بە شێوەیەکی ئازا. بەپەلە.

**ئازایەتی :** ئازایەتی.

**ئازایی:** ئازایی.

**ئازایی یەنە:** لە ئازایەتییدا.

**ئازتەی:** هێشتن. هێڵا ن.

**ئازتەی پۆ :** پێو هێشتن. پێوە هێڵا ن.

**ئازتەی پۆرە:** پیاهێڵا ن. پێدا کردن.

**ئازتەی پۆری:** پیاهێڵا ن. پیاکردن.

**ئازتەی پۆوە:** پێوە هێشتن. پێوە هێڵا ن.

**ئازتەی پنە :** پێ هێشتن.

**ئازتەی پەنە :** پێ هێشتن.

**ئازتەی جیا :** بەجێ هێشتن.

**ئازتەی چنە :** تێدا هێشتن.

**ئازتەی چەنە :** تێدا هێشتن.



**ئازتەیرە :** داهێڵا ن. شۆڕکردنەوە.

**ئازتەینە :** پیاکردن. پیا چەقاندن.

**ئازتەیۆ:** هێشتنەوە.

**ئازتەیۆ پنە :** پێ هێشتنەوە.

**ئازتەیۆ پۆیەنە :** هێشتنەوەی شت لە سنووری خۆیدا.

**ئازتەیۆ پەنە :** پێ هێشتنەوە.

**ئازتەیۆ چنە :** تێدا هێشتنەوە.

**ئازتەی وارە:** دانە بەرهەوا. کردن بە بادا.

**ئازتەی وێرە:** گووی تەڕ بە خۆدا کردن.

**ئازتەیەرە:** داهێڵا ن.

**ئازتەیەنە :** پیا کردن. پیا چەقاندن.

**ئازۆخە :** ئازووخە.

**ئازۆقە :** ئازووخە.

**ئازەب ، ئازەبە:** ئازەب. عارەب.

**ئازەبانە ، ئازەبانێ :** شتێ کە تایبەتی ئازەب بێ.

**ئازەبە :** زیبکەی عازەبی.

**ئازەبەنە :** لەناو عازەبدا. لە عازەبدا.

**ئازەبی:** عازەبی. تەمەن و ژیانی عازب.

**ئازەبی یەنە :** لە سەردومی عازبیدا.

**ئازیز ، ئازیزە:** ئازیز. خۆشەویست.

**ئازیز بەگیانت:** ناوی گۆرانی یەکی هۆرامی یە.

**ئازیز بی یەی:** خۆشەویست بوون.

**ئازیز کەرڤەی :** خۆشەویست کردن.

**ئازیز مەرڤە ، ئازیز مەرڤێ:** ئازیز مردوو.

**ئازیز مەرڤەی :** ئازیز مردن.

**ئازیزی** : ئازیزی.



**ئاژاولە ئەوە نیای:** ئاژاوە نانەوە.

**ئاژاولە چی ، ئاژاولە چی یە :** ئاژاوە چی.

**ئاژاولە کەر ، ئاژاولە کەرە:** ئاژاوە گێڕ.

**ئاژاولە کەرژەی:** ئاژاوەگێڕان.

**ئاژاولە نیایۆ:** ئاژاوە نانەوە.

**ئاژاولە هۆرگڕنای:** ئاژاوە هەڵگیرساندن.

**ئاژاولە هۆر گسینای:** ئاژاوە هەڵگیرساندن.

**ئاژاولێ** : ئاژاوە.

**ئاژاولێنە :** لە ئاژاوەدا.



**ئاژە:** بار و دۆخ. وەزع.

**ئاژەڵ:** ئاژەڵ.

**ئاژەڵدار ، ئاژەڵدارە:** ئاژەڵدار.

**ئاژەڵداری:** ئاژەڵداری.

**ئاژەڵداریۆ:** لە ئاژەڵداری یەوە.

**ئاژەڵداری یەنە :** لە ئاژەڵداریدا.

**ئاژەڵی:** بە شێوەی ئاژەڵ.

**ئاژەنای:** ئاژەنین.



**ئاژەنیا ، ئاژەنیێ:** ئاژەنراو.

**ئاژەنیای:** ئاژەنران.

**ئاژەنیەی:** ئاژەنین.

**ئاژەنینە :** لە ئاژەنیندا.



**ئاژین:** دابەش کردن و پەخش بوونەوەی ئاو بەسەرباخ یا کشتوکاڵدا بە ڕێك و پێکی.

**ئاژین بی یەی:** دابەشبوونی ئاو بەو جۆرەی ووتمان.

**ئاژین کەرژەی:** دابەش کردنی ئاو بەو جۆرەی ووتمان.

**ئاس** : ئاست.

**ئاسا :** ئاسا. وەك. چەشن و شێوە.

**ئاسارە:** ئاسار. شوێنەوار.

**ئاسان ، ئاسانە :** ئاسان.

**ئاسان بی یەی:** ئاسان بوون.

**ئاسان کاری:** ئاسان کاری.

**ئاسان کریا ، ئاسان کریێ:** ئاسان کراو.

**ئاسان کریای:** ئاسان کران.

**ئاسان کەر ، ئاسان کەرە:** ئاسان کەر.

**ئاسان کەرژەی:** ئاسان کردن.

**ئاسان کەرژەیەنە :** لە ئاسان کردندا.

**ئاسانۆ:** لە ئاسانەوە.

**ئاسانە :** ئاسانە. ئاستانە.

**ئاسانەنە :** لە ئاساندا. لە ئاستاندا.

**ئاسانی :** ئاسانی.

**ئاسانێ:** کار بۆ پێکهاتن بە ئاسانی.



**ئاساو:** ئاش.

**ئاساوان ، ئاساوانە :** ئاشەوان.

**ئاساوانی :** ئاشەوانی.

**ئاساوگا :** ئاشگا. جێگای ئاش.

**ئاساوگە :** ئاشگا. جێگای ئاش.

**ئاساو گێڵنێو:** ئاشگێڕێك ئاو.

**ئاساوی ئاو کۆتە :** ئاشی ئاو کەوتوو. مەبەست لە شتێکە یان شوێنێکە کە کپ و بێ دەنگ بێ.



**ئاسای**: ئاسایی. ئاسا. وەك.

**ئاستەی**: هێشتن. هێڵان.

**ئاستەی پنە**: پێ هێشتن.

**ئاستەی پۆیەنە**: هێشتنەوەی شت وەك خۆی.

**ئاستەی پۆ**: پێوە هێشتن.

**ئاستەی پۆرە**: پیا هێڵان. پیا کردن.

**ئاستەی پۆری**: پیا هێڵان. پیا کردن.

**ئاستەی پۆوە**: پێوە هێشتن.

**ئاستەی پەنە**: پێ هێشتن.

**ئاستەی جیا**: بەجێ هێشتن.

**ئاستەی چنە**: تێدا هێشتن.

**ئاستەی چەنە**: تێدا هێشتن.

**ئاستەیرە**: داهێڵان. شۆڕ کردنەوە.

**ئاستەینە**: پیاکردن. پێدا چەقاندن.

**ئاستەیۆ**: هێشتنەوە.

**ئاستەی ۆارە**: بەبادا کردنی شت بۆ جیا بوونەوەی.

**ئاستەیۆ پنە**: پێ هێشتنەوە.

**ئاستەیۆ پۆیەنە**: هێشتنەوەی شت وەك خۆی.

**ئاستەیۆ پەنە**: پێ هێشتنەوە.

**ئاستەیۆ چنە**: تێدا هێشتنەوە.

**ئاستەی وێرە**: گووی تەڕ بە خۆدا کردن.

**ئاستەیەرە**: داهێڵان. شۆڕکردنەوە.

**ئاستەیەنە**: تێ ژەندن. تێ چەقاندن.

**ئاسکۆڵێ**: ئاسکۆڵە.

**ئاسمان**: ئاسمان.

**ئاسمانۆ**: بە ئاسماندا.

**ئاسمانۆری**: بە ئاسماندا بەروە ژوور.

**ئاسمان و ڕیسمان**: ئاسمان و ڕێسمان.

**ئاسمانە**: ئاسمانە.

**ئاسمانەرە**: بە ئاسماندا بەرەو خوار.

**ئاسمانەنە**: لە ئاسماندا. بە ئاسماندا.

**ئاسمانەوان** ، **ئاسمانەوانە**: ئاسمانەوان.

**ئاسمانەوانی**: ئاسمانەوانی.

**ئاسمانی** : ڕەنگی ئاسمانی کە شینێکی کاڵە.

**ئاسن**: ئاسن.

**ئاسن بڕ**: مشاری ئاسن بڕەرەوە.

**ئاسن کێش**: ئاسن فڕێن. موگناتیس.

**ئاسنگەر** ، **ئاسنگەرە**: ئاسنگەر.

**ئاسنگەرەنە**: لە ئاسنگەردا.

**ئاسنگەری**: ئاسنگەری.

**ئاسنگەری یەنە**: لە ئاسنگەریدا.

**ئاسنە کوتە**: پارچە ئاسنی کۆن.

**ئاسنەنە**: لە ئاسندا.

**ئاسنی سەرڎ کوای**: ئاسنی سارد کوتان.

**ئاسنین** ، **ئاسنینە**: ئاسنی. لە ئاسن دروست کراو.

**ئاسۆ** : ئاسۆ.

**ئاسۆگە** : ئاسۆگە.

**ئاسۆیی** ، **ئاسۆییە**: ئاسۆیی. (افقی).

**ئاسووڎە** ، **ئاسووڎێ**: ئاسوودە.

**گــوڕی:** گــوڕی. بــە کــەیفی. بــە هێــزی و توانایی.

**گۆڕیچە:** گۆڕیچە.

**گوڕیلە ، گوڕیلێ:** گوڕی بچکۆلە.

**گوزار:** گوزار؛ لەدوای ((گەشت و)) دێت.

**گوزارش:** گوزارشت. خەبەر دان. راپۆرت.

**گوزارە:** گوزارە. مانا. واتا.

**گۆزاوڵێ:** گۆزاوڵە.

**گۆزتەی:** گۆزان. گۆزاندن. پڕ کردن.

**گۆزتەیۆ:** گۆزاندنەوە. پڕ کردنەوە.

**گۆزرۆانە:** گۆزروانە.

**گۆزنای:** گەوزاندن.

**گۆز و گومەتی:** گۆز و گومبەت.

**گوزەر:** گوزەر.

**گوزەران:** گوزەران. ژیان و ساچین.

**گوزەران کەرڎەی:** گورزەران کردن.

**گوزەر کەرڎەی:** گوزەر کردن.

**گوزەرگا:** گوزەرگا.

**گوزەرگە:** گوزەرگا.

**گوزەرنای:** گوزەراندن.

**گوزەشت:** گوزەشت. چاوپۆشی.

**گوزەشت کەرڎەی:** گوزەشت کردن.

**گۆزەڵێ:** گۆزەی بچووك.

**گۆزێ:** گۆزە.

**گۆزیا ، گۆزیێ:** پڕ کراو لە شلەیەك.

**گۆزیای:** گۆزان. پڕ کران لە شلەیەك.

**گوژمی:** گوژم. تەکان.

**گوژنە:** دەرخۆنە.

**گۆژنەو:** گلێنە.

**گوساخ ، گوساخە:** گوستاخ.

**گوساخی:** گوستاخی.

**گۆستەی:** گۆزان. پڕ کردن لە شلەیەك.

**گۆش:** گوێ.

**گوشاڎ ، گوشاڎە:** گوشاد. فراوان.

**گوشاڎ بی یەی:** گوشاد بوون.

**گوشاڎ کریای:** گوشاد کران.

**گوشاڎ کەرڎەی:** گوشاد کردن.

**گوشاڎی:** گوشادی.

**گۆشاوْ گۆش:** گۆشا و گۆش.

**گۆش ئەنە دارای:** بە گوێ کردن.

**گۆش ئەوەْ زرینگیای:** گوێ زرنگانەوە.

**گۆش ئێشە:** گوێ ئێشە.

**گۆش باریك ، گۆش باریکە:** گوێ باریك.

**گۆش باریکی:** گوێ باریکی.

**گۆشبڕ ، گۆشبڕە:** گوێ بڕ.

**گۆشبەل ، گۆشبەلە:** گوێ بەل.

**گۆش پان ، گۆش پانە:** گوێ پان.

**گۆش پنە دای:** گوێ پێدان.

**گۆش پۆش ، گۆش پۆشە:** گوێ پۆش.

**گۆش پەنە دای:** گوێ پێدان.

**گۆش پنە نەدای:** گوێ پێنەدان.

**گۆشت:** گۆشت.

**گۆشتاوَه:** گۆشتاو.

**گۆشت ئەوَه گرتەی:** گۆشت گرتنـەوە. قەڵەو بوونەوە.

**گۆشت برێژتەی:** گۆشت برژاندن.

**گۆشت برێژنای:** گۆشت برژاندن.

**گۆشت بز:** گۆشت بزن.

**گۆشتپارە:** گۆشتپارە.

**گۆشت پیس ، گۆشت پیسە :** گۆشت پیس.

**گۆشت پیسی:** گۆشت پیسی. چاك بوونـەوەی برین زۆر بە زەحمەت.

**گۆشت تاڵ ، گۆشت تاڵە :** گۆشت تاڵ.

**گۆشت تاڵ بی یەی:** گۆشت تاڵ بوون.

**گۆشت تاڵ کەرڎەی:** گۆشت تاڵ کردن.

**گۆشت تاڵی:** گۆشت تاڵی.

**گۆشت چالەکە :** گۆشت چالەکە.

**گۆشت قاز:** گۆشتی قاز.

**گۆشت قەل:** گۆشتی قەل.

**گۆشت کاوِڕ:** گۆشتی بەرخ.

**گۆشت کەرگ:** گۆشتی مریشك.

**گۆشت کوَه:** گۆشت کوت.

**گۆشت گاوَ:** گۆشت گا و گۆشت مانگا.

**گۆشت گامێش:** گۆشت گامێش.

**گۆشت گرتەی:** گۆشت گرتن.

**گۆشت گرتەیۆ:** گۆشت گرتنەوە.

**گۆشت ماساوَ:** گۆشت ماسی.

**گۆشت مەی:** گۆشت مەڕ.

**گۆشتن ، گۆشتنە :** گۆشت.

**گۆشتنی :** گۆشتنی.

**گۆشت نیای:** لاواز بوون.

**گۆشت وَرەش ، گۆشت وَرەشە :** گۆشت فرۆش.

**گۆشت وَرەشی:** گۆشت فرۆشی.

**گۆشتۆ گرتەی:** گۆشت گرتنەوە.

**گۆشت وشتر:** گۆشت حوشتر.

**گۆشت وەر ، گۆشت وەرە:** گۆشت خۆر.

**گۆشت وەش ، گۆشت وەشە :** گۆشت خۆش.

**گۆشت وەشی:** گۆشت خۆشی.

**گۆشتە زوو:** گۆشتە زوون.

**گۆشتە زوو ئارڎەیۆ:** گۆشتە زوون هێنانەوە.

**گۆشتە زوو ئاوَرڎەیۆ:** گۆشتە زوون هێنانەوە.

**گۆشتە زوو ئەوَە ئارڎەی:** گۆشتە زوون هێنانەوە.

**گۆشتە زوو ئەوَە ئاوَرڎەی:** گۆشتە زوون هێنانەوە.

**گۆشتە زەمین:** گۆشتە زەوی.

**گۆشتە گێرلێ:** گۆشتە گێرە.

**گۆشتە گێللێ:** گۆشتە گێرە.

**گۆش چنە بی یەی:** گوێ لێ بوون.

**گۆش چنە گرتەی:** گوێ لێ گرتن.

**گۆش چۆ بی یەی:** گوێ لێ بوون.

**گۆش چەنە بی یەی:** گوێ لێ بوون.

**گۆش چەنە گرتەی:** گوێ لێ گرتن.

**گۆش خەفنای:** گوێ خەفاندن.

**گۆشدار ، گۆشدارە:** گوێ دار. گێ گر.

**گۆش دارِاینە:** بە گوێ کردن.
**گۆشداری:** گوێداری. گوێ دانە قسە.
**گۆش دای:** گوێدان. گوێ گرتن بۆ قسە.
**گۆش درێژ ، گۆش درێژە:** گوێ درێژ.
**گۆش درێژی:** گوێ درێژی.
**گۆش دینج ، گۆش دینجە:** گوێ دینج.
**گۆش دینجی:** گوێ دینجی. بێ لایەنگرێتی.
**گۆش زرنگیایۆ:** گوێ زرنگانەوە.
**گۆش زل ، گۆش زلە:** گوێ زل.
**گۆش زلی:** گوێ زلی. گوێ گەورەیی.
**گۆش سم ، گۆش سمە:** گوێ سم.
**گۆش سمیا ، گۆش سمییٚ:** گوێ سمراو.
**گۆش سمیای:** گوێ سمران.
**گۆش سمیەی:** گوێ سمین.
**گۆش سووک ، گۆش سووکە:** گوێ سووک.
**گۆش سووکی:** گوێ سووکی.
**گۆش شل کەرڎەی:** گوێ شل کردن.
**گۆش شۆڕ ، گۆش شۆڕە:** گوێ شۆڕ.
**گۆش شۆڕی:** گوێ شۆڕی.
**گۆش قوت ، گۆش قوتە:** گوێ قووت.
**گۆش قوت ئەوۆە بی یەی:** گوێ قووت بوونەوە.
**گۆش قوت ئەوۆە کریای:** گوێ قووت کرانەوە.
**گۆش قوت ئەوۆە کەرڎەی:** گوێ قووت کردنەوە.
**گۆش قوت بی یەیۆ:** گوێ قووت بوونەوە.
**گۆش قوت کریایۆ:** گوێ قووت کرانەوە.
**گۆش قوت کەرڎەیۆ:** گوێ قووت کردنەوە.
**گۆش قوتی:** گوێ قووتی.
**گۆش قوتیلە ، گۆش قوتیلێ:** گوێ قوتی بچکۆلانە.
**گۆش قەل ، گۆش قەلە:** گوێ قەل. گوێ بڕاو. گیانداری گوێ کەت بێت.
**گۆش قەلی:** گوێ قەلی. گوێ کەتی.
**گۆش قورس ، گۆش قورسە:** گوێ گران.
**گۆش قورس بی یەی:** گوێ گران بوون.
**گۆش قورسی:** گوێ گرانی.
**گۆش کریایۆ:** گوێ کرانەوە.
**گۆشکەر ، گۆشکەرە:** گۆشکەر. گوێڕایەڵ.
**گۆش کەرڎەی:** گۆش کردن. بە گوێ کردن.
**گۆش کەرڎەیۆ:** گوێ کردنەوە.
**گۆش کەڕیلە ، گۆش کەڕیلێ:** گوێ کەڕیلە.
**گۆش گران ، گۆش گرانە:** گوێ گران.
**گۆش گران بی یەی:** گوێ گران بوون.
**گۆش گرانی:** گوێ گرانی.
**گۆش گرتەی:** گوێ گرتن.
**گۆشگەڵوو:** ئاڵوو. گوێچکە ماسی.
**گۆشگیر ، گۆشگیرە:** گوێگر.
**گۆشڵێ:** دێزەی بچووک.
**گۆشنای:** تاقی کردنەوە.
**گۆش نەڎای:** گوێ نەدان.
**گۆش نەڎای پنە:** گوێ پێ نەدان.
**گۆش نەگیر ، گۆش نەگیرە:** گوێ نەگر.
**گۆش نەگێرتەی:** گوێ نەگرتن.

**گۆشۆ بی یەی:** بە گوێوە بوون.

**گۆشۆ چەمی:** گۆشەی چاو.

**گۆش وسنای:** گوێ خەفاندن.

**گۆشۆ کریای:** گوێکرانەوە.

**گۆشۆ کەرڎەی:** کوێ کردنەوە.

**گۆش هۆر ۆزتەی:** گوێ هەڵخستن. گوێ شل کردن بۆ مەبەستێك.

**گۆش هۆر ۆستەی:** گوێ هەڵخستن. گوێ شل کردن بۆ مەبەستێك.

**گۆشە:** گۆشە. سووچ. قوژبن.

**گۆشە پڕچنێ:** گوێچکە پڕچکێ.

**گۆشە چەم:** گۆشە چاو.

**گۆشەڎار ، گۆشەڎارە:** گۆشەدار. هەرچی گۆشەی هەبێت.

**گۆشە ڕەپە:** گوێ ڕەپە.

**گۆشە قولاّخ ، گۆشە قولاّخە:** گوێ قۆلاّخ.

**گۆشە قۆلاّخی:** گوێ قۆلاّخی.

**گۆشەك:** گۆشەك. ئالّوو.

**گۆشەك کۆتەی:** ئالّوو کەوتن.

**گۆشەك ۆزتەی:** ئالّوو خستن.

**گۆشەك ۆستەی:** ئالّوو خستن.

**گۆشە گیر ، گۆشە گیرە:** گیر.

**گۆشە گیری:** گۆشە گیری.

**گۆشە لەقێ:** گوێچکە لەقێ.

**گۆشە ملە:** مەبەست لە شتی تەسك و بچووکە.

**گۆشە نشین ، گۆشە نشینە:** گۆشە نیشن.

**گۆشە نشینی:** گۆشە نشینی.

**گۆشەۆارە:** گوارە.

**گۆشەو چەمی:** گۆشەی چاو.

**گۆشە وەنگ ، گۆشە وەنگە:** گوێ قۆلاّخ. گوێ بیست.

**گۆشێ:** دێزە.

**گۆشیا ، گۆشێ:** تەجرەبە کراو.

**گۆشیای:** تەجرەبە کران. تاقی بوونەوە. تاقی کرانەوە.

**گۆشێشە:** گوێ ئێشە. ئازاری گوێ.

**گۆ شی یەی:** لە گۆ کەوتن.

**گوفت:** گوفت. گفت.

**گوفتار:** گوفتار. گفتار.

**گوفتارەنە:** لە گوفتاردا.

**گوفت دای:** گوفت دان.

**گوفت و گۆ:** گوفت و گۆ.

**گوفت و گۆ کەرڎەی:** گوفت و گۆ کردن.

**گۆ کۆتەی:** لە گۆ کەوتن. تەزین لە سەرمانا.

**گۆ کەوتەی:** لە گۆ کەوتن. تەزین لە سەرمانا.

**گۆ گرتەی:** گۆ گرتن. پێچەوانەی لە گۆ کەوتن.

**گۆگرڎە:** گۆگرد.

**گۆگە:** گۆگ. بنەمووری کورتی خڕ. تۆپی بچووکی دارینی یاری کردن.

**گول ، گولە:** گول. ناشرین. گەڕۆڵ. شتی تام ناخۆش.

**گوڵ**: گوڵ. نەخش. نەقش.
**گۆڵ ، گۆڵـە**: گـۆڵ. گـورچ. وتەیەکـە لـەدوای ((گورج و)) دێت بە هەمان واتا.
**گولان**: گولان؛ دووەم مانگە بەهار.
**گولا نجلانە ، گولا نجلانێ**: بچکۆلانە.
**گولا نجلانەیی**: بچکۆلانەیی.
**گولا نجلە ، گولا نجلێ**: بچکۆلە.
**گولا نجلەیی**: بچکۆلەیی.
**گولا نجولە ، گولا نجولێ**: بچوکۆلانە.
**گولا نجولەیی**: بچکۆلایەنی.
**گولانۆ بی یەی**: بچووك بوونەوە.
**گولانۆ کریای**: بچووك کرانەوە.
**گولانۆ کەرذەی**: بچووك کردنەوە.
**گولانە ، گولانێ**: بچووك.
**گولانە ئەوَە بی یەی**: بچووك بوونەوە.
**گولانە ئەوَە کریای**: بچووك کرانەوە.
**گولانە ئەوَە کەرذەی**: بچووك کردنەوە.
**گولانە بی یەیۆ**: بچووك بوونەوە.
**گولانە کریایۆ**: بچووك کرانەوە.
**گولانە کەرذەیۆ**: بچووك کردنەوە.
**گولانەنە**: لە گولاندا.
**گولانەیی**: بچووکی.
**گولاوَ**: گولاو.
**گۆلاوَ**: گۆلاو. گۆل.
**گولاوَ پاش**: گولاو پاش. گولاو پرژێن.
**گولاوَ پاشی**: گولاو پرژاندن.
**گولاوَ پژگن**: گولاو پرژێن.

**گولاوَ گرتەی**: گولاو گرتن.
**گولاوَ گیر ، گولاوَ گیرە**: گولاوگ.
**گولاوَە**: گۆلاو. گۆل.
**گولاوَی**: هەرمێ گولاوی.
**گولاوَیە**: گولە باخ. گولی خۆمانە.
**گوڵ ئەوَە گرتەی**: گوڵ گرتنەوە.
**گـوڵ بـڕ ، گـوڵ بـڕە** : دروێنـەی سەرچـڵی خەلە.
**گۆلبڕ ، گۆلبڕە**: گۆل بڕ.
**گۆل بڕیەی**: گۆل بڕین.
**گوڵ بەدەم ، گوڵ بەدەمە** : گوڵ بەدەم.
**گوڵ بە دەمی**: گوڵ بە دەمی.
**گۆلبەن**: گۆلبەند.
**گۆلبەنذ**: گۆڵبەند؛ ئاوێکە کرابێت بـە گـۆل گۆل تا ئاژەڵ لێی بخواتەوە.
**گول بی یەی**: گول بوون. ناخۆش بوون.
**گوڵپ**: ناوی دێیەکی هۆرامانە.
**گوڵپۆ**: لە گوڵپەوە.
**گوڵپەنە**: لە دێی گوڵپدا.
**گوڵپی ، گوڵپی یە**: خەڵکی دێی گوڵپ.
**گوڵجار**: گوڵجار. گوڵزار.
**گـوڵ ئـەوَە چـن ، گـوڵ ئـەوَە چـنە**: گـوڵ چنەرەوە. خۆشەچن.
**گـوڵ ئـەوَە چـنیەی**: خۆشەچـنی. گـوڵ چنینەوە.
**گوڵچن ، گوڵچنە**: گوڵچن. گوڵبژێر.
**گوڵ چنی**: گوڵ چنی.

**گوڵ چنیەی:** گوڵ چنین.

**گوڵ چنیەیۆ:** گوڵ چنینەوە.

**گوڵ خونچە :** گوڵ خونچە.

**گوڵخەنڎان:** گوڵخەندان، جۆرە گوڵێکە.

**گوڵخەنەران:** گوڵ خەندان.

**گوڵدار ، گوڵدارە:** گوڵدار.

**گوڵدان :** گوڵدان.

**گۆڵ دای:** سوور هەڵگەڕان.

**گۆڵ دای:** خەڵەتاندن. فریودان.

**گۆڵ دریا ، گۆڵ دریێ:** خەڵەتاو. فریودراو.

**گۆڵ دریای:** خەڵەتان. فریو خواردن.

**گۆڵدەر ، گۆڵدەرە:** فریودەر. خەڵەتێنەر.

**گوڵڕەنگ ، گوڵڕەنگە :** گوڵڕەنگ. بە ڕەنگی گوڵ.

**گوڵ ڕیزای:** گوڵ وەرین.

**گوڵ ڕێزنای:** گوڵ وەراندن.

**گوڵزار:** گوڵزار.

**گوڵزارەنە :** لە گوڵزاردا.

**گوڵزەمەق:** گوڵی زەمبەق.

**گوڵسان:** گوڵستان. گوڵسێن.

**گوڵسانەنە :** لە گوڵستاندا.

**گوڵ سورمە :** گوڵ سرمە. گوڵ سوڕمە.

**گوڵشەن :** گوڵشەن. گوڵجاڕ.

**گوڵشەنەنە :** لە گوڵشەندا.

**گوڵ عومەر:** ناوی ئەسڵی خورماڵ.

**گول کەرڎەی:** گول کردن. ناخۆش کردن.

**گوڵ کەرڎەی:** گوڵ کردن.

**گۆڵ کەرڎەی:** فریودان. گۆڵ کردن.

**گوڵ گرتەی:** گوڵ گرتن.

**گوڵ گرتەیۆ:** گوڵ گرتنەوە. گرتنەوەی تۆپ بە هەواوە لە کایەی تۆپیقارێندا.

**گۆڵ گۆڵ:** وتەی بانگ کردنی گوێرەکە. گۆڵ گۆڵ.

**گوڵ گوڵێن ، گوڵ گوڵێنە :** گوڵگوڵی.

**گوڵگوون ، گوڵگوونە :** گوڵگوون.

**گوڵلەبەن :** گوڵلەبەند.

**گوڵلەبەنڎ :** گوڵلەبەند.

**گوڵلە نەبڕ:** گوولە بەند.

**گوڵمووتە :** گوڵم. لەوێچ. قومێك.

**گوڵمە :** گوڵم. لەوێچ. پڕ بە مست ئاو.

**گۆڵمەز:** گۆڵمەز. گاڵتە.

**گۆڵمەز چی ، گۆڵمەز چیە :** گاڵتەچی.

**گۆڵمەز خانە :** گاڵتە جاڕ.

**گۆڵمەز کەرڎەی:** گاڵتە کردن.

**گوڵمێخ:** گوڵمێخ. بزماری درێژی سەرپان.

**گوڵنار:** گوڵنار.

**گولۆ ئامای پێۆەنە :** گەروو هاتنەوە یەك.

**گولۆ ئامایۆ پێۆەنە :** گەروو هاتنەوە یەك.

**گول ۋاتەی:** قسەی ناخۆش ووتن.

**گول ۋاچ ، گول ۋاچە :** ناخۆ بێژ.

**گول وارڎەی:** خواردنی شتی پیس و ناخۆش.

**گۆڵ وارڎەی:** فریو خواردن. خەڵەتان.

**گولۆپ:** گلۆپ.

**گوڵۆچــــن ، گوڵۆچــــنە :** گــوڵ وەچــێن. خۆشەچن.

**گوڵۆچـنی :** گـوڵ چـنینەوە. گوڵـە وەچـنین. خۆشەچنی.

**گولو دوورئـاوای ، گولۆ دوورئـاوای :** مەبەست لە کەسێکی گۆشە گیرە.

**گولو دووراوای ، گولۆ دووراوای :** مەبەست لـە کەسێکی گۆشە گیرە.

**گوڵۆز :** گوڵۆز.

**گوڵــۆ گرتــەی :** گــوڵ گرتنــەوەی گەمــەی تۆپقارێن.

**گوڵۆ گرتەی :** گەڕوو گرتن.

**گوڵۆ گیر ، گوڵۆ گیرە :** گوڵ گرەوە.

**گوڵۆ گێریای :** گەڕوو گیران.

**گوڵو مەجلێسی :** گوڵی ناو مەجلیس.

**گولــوو :** وتەیەکــە گوێرەکــەی پــێ بــانگ ئەکرێ.

**گولوولە :** وتەی گوێرەکە بانگ کردنە.

**گلوولە گلوولە :** وتەی گوێرەکە بانگ کردن.

**گــوڵ وَنــە کــەرڎەی :** گــۆڵ لــێ کــردن. هەڵخەڵەتاندن.

**گوڵۆە :** گەرووی چیا. لوولە دۆڵ.

**گوڵۆەنڎ کەرڎەی :** گوڵۆێنك کردنە مل.

**گوڵۆەنڎە :** گوڵۆێنك.

**گوڵۆەنڎی :** گوڵۆێنك.

**گوڵۆەننە :** گوڵۆێنك.

**گوڵۆەننی :** گوڵۆێنك.

**گوڵ وَەنۆشە :** گوڵی وەنەوشە.

**گوڵ وەنەوشە :** گوڵی وەنەوشە.

**گۆڵ وەنە کەرڎەی :** گۆڵ لێ کردن.

**گوڵۆی :** گەروو. قوڕگ.

**گوڵۆێشە :** گەروو ئێشە. قوڕگێشە.

**گوڵۆینە :** گوڵبێنە.

**گوڵۆیەنە :** لە گەروودا.

**گۆڵ هۆر دای :** گۆل هەڵدان.

**گۆڵ هۆر دەر ، گۆڵ هۆر دەرە :** گۆل هەڵدەر.

**گوڵ هـۆ گـوڵ هـۆ مینـا :** نـاوی گـۆرانی یـەکی هۆرامی یە.

**گولـە :** گولـە؛ پیـاوی ژن جـوانی ئیرەیـی پـێ براو.

**گۆڵە :** گۆل. دێراو.

**گۆڵە :** گۆڵ. فێڵ.

**گوڵە پڕووزە :** گوڵە پڕووزە. قەرە خەرمان.

**گوڵە چای :** گوڵە چا.

**گوڵە چنوور :** گوڵە چنوور.

**گوڵە چەمێشە :** گوڵە چاوێشە.

**گوڵە ڕووتە :** گوڵڕووت؛ جۆرە گەنمێکە.

**گوڵە ڕۆەنینە :** گوڵە ڕۆنینە.

**گوڵە زەڕات :** گوڵی گەنمە شامی.

**گوڵە ژاڵە :** گوڵی ژاڵە.

**گوڵە سێڎاران :** گوڵی چاوکتکە.

**گوڵــە قەڎیفــە :** گــوڵێکی نــەرمی مــۆرە لــە قەدیفە دەکات.

**گوڵە گەبڵە :** گوڵی گیای گەبڵە.

**گۆڵە گرای:** حەز لێ کردن. سەر خوران بۆ شتێك. ئارەزوو بزوان.
**گوڵە گەنم:** گوڵە گەنم.
**گوڵە لۆ:** گوڵە لۆ. چڵە لۆ.
**گوڵە لۆلاوْ:** گوڵە لاولاو.
**گوڵە مێخەك:** گوڵە مێخەك.
**گوڵە مینا:** گوڵە مینا.
**گوڵەنگ:** گوڵەنگ.
**گوڵەنگ بڕیەی:** گوڵەنگ بڕین.
**گوڵەنگدار ، گوڵەنگدارە:** گوڵەنگدار.
**گولە نەبڕ:** گوللەبەند.
**گوڵە وەنەوشە:** گوڵە وەنەوشە.
**گوڵە هەرمەڵە:** گوڵە هێرۆ.
**گوڵە یەوْ:** گوڵە جۆ.
**گولی:** دەردی گولی. گەڕۆڵی.
**گۆڵێ:** حەز. ئارەزوو. دەروون.
**گوم ، گومە:** ون. گوم. نادیار.
**گوماڵتــاوْی:** گومــاوی بــچووك. چــاڵاوی بچووك.
**گومان ئەوْە کۆتەی:** کەوتنە گومانەوە.
**گومان ئەوْە وْزتەی:** خستنە گومانەوە.
**گومان ئەوْە وستەی:** خستنە گومانەوە.
**گومانبار ، گومانبارە:** گومانبار.
**گومانباری:** گومانباری.
**گومانبەر ، گومانبەرە:** گومان کەر.
**گومان بەرڎەی:** گومان کردن.
**گوماندار ، گوماندارە:** بە گومان.
**گوماندار:** بە گومانی.
**گومانکەر ، گومانکەر:** گومانکەر.
**گومان کەرڎەی:** گومان کردن.
**گومانۆ کۆتەی:** کەوتنە گومانەوە.
**گومانۆ وْزتەی:** خستنە گومانەوە.
**گومانۆ وْستەی:** خستنە گومانەوە.
**گومانی:** گومان.
**گومانیەنە:** لە گوماندا.
**گوماوْی:** گۆماو.
**گوم بی یەی:** گوم بوون. وون بوون.
**گومڕا ، گومڕێ:** گومڕا.
**گومڕا بی یەی:** گومڕا بوون.
**گومڕا کریای:** گومڕا کران.
**گومڕا کەرڎەی:** گومڕا کدن.
**گومڕایی:** گومڕایی.
**گومرگ:** گومرگ.
**گومرگچی ، گومرگچیە:** گومرگچی.
**گومرگ کریا ، گومرگ کریێ:** گومرگ کراو.
**گومرگ کریای:** گومرگ کران.
**گومرگ کەر ، گومرگ کەرە:** گومرگ کەر.
**گومرگ کەرڎەی:** گومرگ کردن.
**گوم کەرڎەی:** گوم کردن. وون کردن.
**گومنای:** گماندن.
**گومە:** گمەی کۆتر. گۆم.
**گومەزی:** گومەز. گومبەز.
**گومە سار ، گومە سارە:** گوم بووی بێ سەر و شوێن.

**گومه سار بی یەی:** گوم بوونی بێ سەر و شوێن.

**گومه سار کەرژەی:** گوم کردنی بێ سەر و شوێن.

**گومه ساری:** بێ سەر و شوێنی ی و گوم بوون.

**گومه گوم:** گومه گومی کۆتر.

**گومی:** گۆمی ئاو و شتی کەی شله.

**گومیی:** وونی. نادیاری.

**گون:** گون.

**گۆنا:** گۆنا. کوڵم.

**گونا:** تاوان. گوناح.

**گونا بار ، گونا باره:** گوناحبار.

**گونا بار بی یەی:** گوناحبار بوون.

**گونابار کریای:** گوناحبار کران.

**گونا بار کەرژەی:** گوناحبار کردن.

**گوناباری:** گوناحباری.

گوناح: گوناح.

**گوناحبار ، گوناحباره:** گوناحبار.

**گوناحبار بی یەی:** گوناحبار بوون.

**گوناحبار کریای:** گوناحبار کران.

**گوناحبار کەر ، گوناحبار کەر:** گوناحبار کەر.

**گوناحبار کەرژەی:** گوناحبار کردن.

**گوناحباری:** گوناحباری.

**گوناع:** گوناع.

**گونا عبار ، گونا عباره:** گوناحبار.

**گونا عبار بی یەی:** گوناحبار بوون.

**گونا عبار کەرژەی:** گوناحبار کردن.

**گوناعباری:** گوناحباری.

**گونا کار ، گونا کەر:** گوناحکار.

**گونا کاری:** گوناحکاری. گونا باری.

**گوناو گوون ، گوناو گوونه:** گۆنا و گۆن. جۆرا و جۆر. ڕەنگا و ڕەنگ.

**گوناو گون ، گوناو گونه:** گۆنا و گۆن.

**گوناو گونی:** گۆنا و گۆنی.

**گوناو گوونی:** گۆنا و گۆنی.

**گوناه:** گوناه. گوناح.

**گوناهبار ، گوناهباره:** گوناهبار.

**گوناهبار بی یەی:** گوناهبار بوون.

**گوناهبار کریای:** گوناهبار کران.

**گوناهبار کەرژەی:** گوناهبار کردن.

**گوناهباری:** گوناهباری. گوناحباری.

**گوناهکار ، گوناهکاره:** گوناهکار.

**گوناهکاری:** گوناهکاری. گوناحکاری.

**گوناهکەر ، گوناهکەره:** گوناه ئەنجامدەر.

**گوناه کەرژەی:** گوناه ئەنجامدان.

**گونبڕ ، گونبڕه:** خەتەنه کەر.

**گون بڕیەی:** خەتەنه کردن.

**گون بەر ئارژەی:** گون دەرهێنان.

**گون بەر ئامای:** گون دەرهاتن.

**گون بەر ئاوڕ ، گون بەر ئاوڕه:** گون دەرهێنەر. مەبەست مرۆڤی دڕی بێ شەرمه.

**گون بەر ئاوْرڤەی:** گون دەرهێنان.

**گونج:** گونج.

**گونجکاری:** گونجکاری.

**گونجنای:** گونجاندن.

**گونجە:** گونجە. زەمبوورەی ئاش.

**گونجەنە:** بەندە خوێن.

**گونجەنە کێش:** شتێکە بەندە خوێنی پێ ئەخرێتە ناو پزووەوە.

**گونجیا ، گونجیێ:** گونجاو.

**گونجیای:** گونجان. گونجایش.

**گون چیای:** مەبەست زەرەر کردنە.

**گوندار ، گوندارە:** زۆر دار. بە زەبر. دەسەلاتدار.

**گوندڕیا:** گون دڕاو. گون تەقیو.

**گون دڕیەی:** گون دڕین. گون تەقاندنەوە.

**گونڤە ، گونڤێ:** گوندە. ملهووڕ.

**گونڤەلانی:** شەڕە تۆپەڵە بەفر.

**گونڤەڵبەس:** گوندەڵبەست.

**گونڤەڵ کەشی:** گوندەڵبەست.

**گونڤەڵە لووتە ، گونڤەڵە لووتێ:** گوندەڵە لووتە. کەسێ لووتی لە گوندەڵ بچێت.

**گونڤەڵە گوو:** تۆپەڵە گوو. بە کەسێکی کورتە بالا ئەوترێت لە رووی سووکایەتی یەوە.

**گونڤەڵی:** تۆپەڵ. تۆپەڵە بەفر.

**گونڤەیی:** زۆر داریی. ملهووڕی.

**گونڤین و ڕۆەن:** گوندێنە و ڕۆن.

**گونڤینە:** گوندێنە. گونگێنە.

**گون زل:** کێر قەوی. قۆڕ.

**گون شۆڕ:** گون قۆڕ.

**گون شۆڕی:** گون قۆڕی.

**گونکە:** گونك. گونتك. ئەنگوتك.

**گونکە ئەژمار:** مەبەست لە پیاوی ڕژدی پیسکەیە.

**گونکە ئەژمارای:** مەبەست لە ڕژدی و پیسکەییە.

**گونکە پڕای:** لێ بوونەوەی پارچەی بچووك لە گونتك؛ بە بیر و ڕای ژنان نیشانەی هاتنی میوانە.

**گون کەرڤەی تالە ساوْی:** خۆ گرتن. مەبەست خۆ گرتن و خۆ شیرین کردن و ناز کردنە.

**گونکە گرتەی:** گونگ گرتن.

**گون کێشتەیرە:** سوور بوون لەسەر خواست.

**گون گرتەی:** مەبەست زیان پێ گەیاندنە.

**گونگیر ، گونگیرە:** مەبەست زیان لێدەرە.

**گوننە ، گوننێ:** زۆر دار. ملهووڕ.

**گوننەلانی:** شەڕە تۆپەڵە بەفر.

**گوننەڵبەس:** گوندەڵبەست.

**گوننەڵکەشی:** گوندەڵبەست.

**گوننەڵە لووتە ، گوننەڵە لووتێ:** کەسێك لووتی لە تۆپەڵ یان گوندەڵ بچێت.

**گوننەڵەگوو:** تۆپەڵە گوو. کورتە بالای پڵت.

**گوننەڵی:** تۆپەڵ. تۆپەڵە بەفر.

**گوننەیی:** زۆر داریی. ملهووڕی.

**گوننین و ڕۆەن:** گوندێنە و ڕۆن.

**گونینە:** گوندێنە. گونگێنە.

**گونۆر:** گونۆر.

**گون هۆرسنگنای:** مەرایی کردن. ناز کێشان.

**گۆ نەگرتەی:** گۆ نەگرتن. هێز تیا نەمان.

**گونی:** گۆنی. گوێنی.

**گۆنیا:** گۆنیا؛ ئامرازێکی ئەندازیاری یە.

**گۆنیا کریای:** گۆنیا کران.

**گۆنیا کەرڎەی:** گۆنیا کردن.

**گونین و ڕۆەن:** گوندێنە و ڕۆن.

**گونینە:** گوندێنە. گونگێنە.

**گونیە:** گۆنی. گوێنی.

**گوو:** گوو.

**گوو ئاسن:** ئاسنی تێکەڵ و پاکژ نەکراوە. گوو راسن.

**گووار:** بەچکەی نێری کەو.

**گووارە:** گوارە؛ خشڵی گوێ.

**گووارە گیرە:** گیایەکی بەهاری یە و شیلەی زۆری پێوەیە و بەئاسانی دەلکێ بەشتەوە.

**گوواری:** بەچکەی کەو.

**گو واریی:** سەردەمی بەچکەیی بەچکە کەو.

**گووان:** گووان.

**گوواندانی:** گوواندێن.

**گووانناني:** گوواندێن.

**گوواوە:** گوواو.

**گوواوی:** **گوواو**.

**گوواویی** ، **گوواوییە:** شتی گوواویی.

**گوواوی بی یەی:** گوواوی بوون.

**گوواوی کریای:** گوواوی کران.

**گوواوی کەرڎەی:** گوواوی کردن.

**گوو ئەنە بی یەی:** گوو تێ بوون.

**گوو ئەنە کریای:** گوو تێکران، خراپ کران.

**گوو ئەنە کەرڎەی:** گوو تێکردن، خراپ کردن.

**گو بڕ گو بڕ:** گو پچڕ گو پچڕ.

**گوو پنە کەرڎەی:** گوو پێکردن. ترساندن.

**گوو پەنە کەرڎەی:** گوو پێکردن. ترساندن.

**گوو تشیا** ، **گوو تشیێ:** گوو ترشاو. زۆرخۆر.

**گوو تشیای:** گوو ترشاندن. مەبەست زۆرخۆریە.

**گوو توتە:** گووی سەگ.

**گووجێ:** گۆجە. گووجوو.

**گۆۆ چیچەی:** گۆی مەمك.

**گوو خلنێ:** گوو خلێنکە. قالۆنچە.

**گوو دڕیەی:** مەبەست ورگ دڕینە.

**گووروونی:** گووروونی. پارچەیەکی ئاوریشمی جوانی گوڵ سورمەیە.

**گۆۆزتەی:** لە گۆخستن.

**گۆ ۆستەی:** لە گۆخستن.

**گوو زل** ، **گوو زلە:** مەبەست زۆر خۆرە.

**گوو زلی:** مەبەست زۆر خۆری یە.

**گوو کت:** گوو پشیله.

**گوو کەر ، گوو کەرە:** گوو کەر.

**گوو کەرژەی:** گوو کردن.

**گوو کەرژەی وێرە:** گوو بەخۆدا کردن.

**گوو کەرژەیناوۆە:** خراپ کردنەوەی کار.

**گوو کەرژەینە:** گو تێ کردن. کار خراپ کردن.

**گوو کەرە وێر ، گوو کەرە وێرە:** گوو بە خۆدا کەر.

**گوو گلنێ:** گوو خلێنکە. مەبەستیش لە ژنی کوڵە بنەی خڕی ناشیرینە.

**گوو کەك:** گووی کێچ.

**گوو گیریای:** گوو گیران. قەبز بوون.

**گوو ماڵ ، گوو ماڵە:** گوو ماڵ. گوو پاك کەرەوە.

**گوو ماڵی:** گوو ماڵین. گوو پاك کردنەوە.

**گوو ملە:** گوو مشك.

**گوو مەش:** گووی مێش.

**گوونی:** گوونی. گونیە. گوێنی.

**گوونیەنە:** لە گوێنیدا.

**گوو وشك ئەوۆەکەر ، گوو وشك ئەوۆەکەرە:** مەبەست مرۆڤی زۆر پیسکەیە.

**گوو وشك کەرژەیۆ:** مەبەست زۆر پیسکەیی یە.

**گوو وشکۆ کەر ، گوو وشکۆ کەرە:** رژد. پیسکە.

**گوو وشکۆ کەرژەی:** مەبەست زۆر پیسکەیی یە.

**گوو وەر ، گوو وەرە:** گوو خۆر؛ لە ڕووی سووکایەتی پێکردنەوە دەوترێ.

**گوو هەش:** گوو ورچ.

**گووین ، گووینە:** گووین. گوواوی.

**گۆهەر:** گەوهەر. دڕ.

**گۆهەر ئەشناس ، گۆهەر ئەشناسە:** گەوهەر ناس؛

**گۆهەر ئەشناسی:** گەوهەر ناسی.

**گۆهەربار ، گۆهەربارە:** گەرهەربار. کەسێك کە بارەکەی گەوهەر بێت.

**گۆە:** گۆ. هەرچی گردو لووس و خڕ بێ و لە شووشە یان دار یان شتی تر دروست کرابێت.

**گۆەملە:** جۆرە ملوانکەیەکی زێڕە.

**گۆە و چیچەی:** گۆی مەمك.

**گۆە و مەمەی:** گۆی مەمگ.

**گە:** گە؛ پاشگرێکە بە واتای شوێن و کات.

**گەبر ، گەبرە:** گەبر. گاور.

**گەبری:** گاوری.

**گەبڕێ:** گەمڕە. گەمار. چڵك.

**گەبڵە:** گیایەکی بەهاریی کوێستانی یە گوڵی زەرد و سوور دەرئەکات و بە کوڵاوی ئەخورێت.

**گەبڵە گا:** جێگای سەوز بوونی گیای گەبڵە.

**گەپ:** گەپ. گاڵتە.

**گەپ کەرژەی:** گەپ کردن.

**گەچ:** گەچ.

**گەچاوە:** گەچاو.

**گەچکاری:** گەچکاری.

**گەچکاریەنە:** لە گەچکاریدا.

**گەچین ، گەچینە:** گەچاوی.

**گەچین بی یەی:** گەچاوی بوون.

**گەچینە:** ناوی دێیەکی هۆرامانی عێراقە.

**گەچینەیی ، گەچینەییە:** خەڵکی گەچینە.

**گەڎا ، گەڎێ:** گەدا. هەژار و بێ نەوا.

**گەڎا کۆتەی:** گەدا و لات کەوتن.

**گەڎا وزتەی:** گەدا خستن.

**گەڎا وستەی:** گەدا خستن.

**گەڎایی:** هەژاری و بێ نەوایی.

**گەڎاییێنە:** لە گەییدا.

**گەڎ و گیپاڵ:** گەدە و دەوروبەری.

**گەڎو گیفاڵ:** گەدە و دەوروبەری.

**گەڎە زل ، گەڎە زلە:** گەدە قەوی.

**گەڎە زلی:** گەدە گەورەیی.

**گەڎێ:** گەدە. وورگ.

**گەر ، گەرە:** گەر. پاشرێکە بەهەر ناوێکەوە نووسا ئەیکات بە بکەر (فاعل) گوێرووی دەستار.

**گەڕ ، گەڕە:** گەڕ. گەڕۆڵ. تەشقەلە. خولی زەمانە.

**گەراج:** گەراج. گەڕاج.

**گەراجۆری:** بە گەراجدا بەرەو ژوور.

**گەراجەرە:** بە گەڕاجدا بەرەو خوار.

**گەراجەنە:** لە گەراجدا.

**گەڕاڵ ، گەڕاڵە:** گەڕیدە. گەڕاڵ. گەڕندە.

**گەڕاڵی:** گەڕیدەیی. زۆر گەڕان.

**گەڕاوە:** گەڕاو.

**گەڕ باز ، گەڕ بازە:** تەشقەڵە باز.

**گەڕ بازی:** تەشقەڵە بازی.

**گەڕ بی یەی:** گەڕ بوون.

**گەر پێچ:** گیران. گرفت.

**گەر پێچ کەرڎەی:** گیران. گرفت کردن.

**گەرچەك:** گەرچەك.

**گەرچیوەزی:** فێڵ و تەڵەکە. مەرایی.

**گەرچیوەزیکەر ، گەرچیوەزیکەرە:** فێڵ باز. تەڵەکەباز.

**گەرچیوەزی کەرڎەی:** فێڵ و تەڵەکە کردن. مەرایی کردن.

**گەرڎانە:** گەردانە.

**گەرڎاوە:** گەرداو.

**گەرڎش:** گەردش. گەڕان و سووڕانەوە.

**گەرڎ و گوڵ:** گەرد و گوڵ. سەرەتا.

**گەرڎ و گوڵو سەعبی:** گەرد و گوڵی بەیانی.

**گەرڎ و گەرڎانە:** گۆرانی یەکی هۆرامی یە.

**گەرڎوون ئامان:** گۆرانی یەکی هۆرامی یە.

**گەرڎوون ئەشناس ، گەرڎوون ئەشناسە:** گەردوون ناس.

**گەرڎوون ئەشناسی:** گەردوون ناسی.

**گەرڎوون شناس ، گەرڎوون شناسە:** گەردوون ناس.

**گەرڎوون شناسی:** گەردوون ناسی.
**گەرڎە:** گەرد. تۆز. ئاوریشمی ڕەشی خاو کە گوڵنگەی چەفتە و پووشینی لێ دروست ئەکرێت. گەردە.
**گەرڎە گەرڎە:** ناوی گۆرانی یەکی هۆرامی یە.
**گەرڎە لوول:** گەردە لوول.
**گەرڎە ملە:** گەردە مل.
**گەرڎەن:** گەردن.
**گەرڎەن ئازاڎ کەرڎەی:** گەردن ئازاد کردن.
**گەرڎەن ئازاڎی:** گەردن ئازادی.
**گەرڎەن ئازاڎی کەرڎەی:** گەردنی یەکتر ئازاد کردن.
**گەرڎەنبەنڎە:** گەردنبەند. گەردانە.
**گەرڎەنبەننە:** گەردنبەند. گەردانە.
**گەرڎەن جەمووی باریك تەر ، گەرڎەن جەمووی باریك تەرە:** بریتی یە لە کەسێك کە زۆر پابەندی حەق و دادپەروەی بێت.
**گەرڎەن خەنەین ، گەرڎەنەینە:** گەردەن خەناوی.
**گەرڎەن خەنەینی:** گەردن خەناوێتی.
**گەرڎەن زەرڎ ، گەرڎەن زەرڎە:** گەردن زەرد.
**گەرڎەن زەردی:** گەردن زەردی.
**گەرڎەن کەچ ، گەرڎەن کەچە:** گەردن کەچ.
**گەرڎەن کەچ بی یەی:** گەردن کەچ بوون.
**گەرڎەن کەچ کەرڎەی:** گەردن کەچ کردن.

**گەرڎەن کەچی:** گەردن کەچی.
**گەرڎەن گرتەی:** گەردن گرتن. یەخە گرتن.
**گەرڎەنگیر ، گەرڎەنگیرە:** گەردن گر. یەخە گر.
**گەرڎەنگیری:** گەردنگیریی.
**گەرڎەن لۆغە:** گەردن لغ. گەردانە.
**گەرڎی:** ماددەیەکی سڕکەرە وەك تلیاك.
**گەرڎیلە:** گەردیلە. هەرە ووردیلە.
**گەڕ زان ، گەڕ زانە:** تەشقەڵەچی.
**گەڕ زانی:** تەشقەڵەچێتی.
**گەڕکە:** دەردی گەڕیی حەیوانات.
**گەڕ کەر ، گەڕ کەرە:** گەڕ باز. گزیکەر.
**گەڕ کەرڎەی:** گەڕ کردن. گەڕ بازی.
**گەرم ، گەرمە:** گەرم.
**گەرما:** گەرما.
**گەرماژۆ:** گەرماژۆ. گەرما بردوو.
**گەرما بەرڎە ، گەرما بەرڎێ:** گەرما بردوو.
**گەرما بەرڎەی:** گەرما بردن.
**گەرما پیم:** گەرماپێو.
**گەرما پیمای:** گەرمی پێوان.
**گەرمانە:** لە گەرمادا.
**گەرماوْ:** گەرماو. حەمام.
**گەرماو گەرم:** گەرما و گەرم.
**گەرمای:** گەرمایی.
**گەرمایێنە:** لە گەرمادا. لە گەرماییدا.
**گەرم ئەرە بی یەی:** گەرم داهاتن.
**گەرم ئەرە پۆژنای:** گەرم داپۆشین.

**گـه رم ئـه‌ره کریـای:** گـه‌رم داکـران. گـه‌رم ڕاهێنران.

**گـه رم ئـه‌ره کـه‌رژه‌ی:** گـه‌رم داکـردن. گـه‌رم ڕاهێنان.

**گەرم ئەۋە بی یەی:** گەرم بوونەوە.

**گەرم ئەۋە کریای:** گەرم کرانەوە.

**گەرم ئەۋە کەرژەی:** گەرم کردنەوە.

**گەرم بی یەی:** گەرم بوون.

**گەرم بی یەیرە:** گەرم دابوون.

**گەرم بی یەیۆ:** گەرم بوونەوە.

**گەرم بی یەیەرە:** گەرم دابوون.

**گەرم پۆژنایرە:** گەرم داپۆشین.

**گەرم پۆژنایەرە:** گەرم داپۆشین.

**گەرم پۆژیایرە:** گەرم داپۆشران.

**گەرم پۆژیایەرە:** گەرم داپۆشران.

**گەرم کریای:** گەرم کران.

**گەرم کریایۆ:** گەرم کرانەوە.

**گەرم کەرژەی:** گەرم کردن.

**گەرم کەرژەیرە:** گەرم داکردن. گەرم ڕاهێنان.

**گەرم کەرژەیۆ:** گەرم کردنەوە.

**گەرم کەرژەیەرە:** گەرم داکردن. گەرم ڕاهێنان.

**گەرم گرتەی:** بە گەرم گرتن.

**گەرم گرتەیرە:** بە گەرم داگرتن.

**گەرمڵەینە:** چێشتی گەنمە کوتراو.

**گەڕنای:** گەڕەلاوژە کردن. چەنە دان.

**گەرمۆ بی یەی:** گەرم بوونەوە.

**گەرمۆ کریای:** گەرم کرانەوە.

**گەرمۆ کەرژەی:** گەرم کردنەوە.

**گەرم و گوڕ ، گەرم و گوڕە:** گەرم و گوڕ.

**گەرم و گوڕی:** گەرم و گوڕی.

**گەرم و گوڕیەنە:** لە گەرم و گوڕیدا.

**گەرم و نەرم ، گەرم و نەرمە:** گەرم و نەرم.

**گەرم و نەرمی:** گەرم و نەرمی.

**گەرمە:** گەرمك. گەرمە. کاتی زۆر شت.

**گەرمەرۆ:** یەك لەسەر یەك. خێرا و بە پەلە.

**گەرمەزام:** گەرمە برین.

**گەرمە ژەن:** مەشکە ژەندن بەوەی کە ئاوی گەرمی تێ بکرێت یان ئاگری لەژێرا بکرێتەوە.

**گەرمەسێر:** گەرمە سێر. گەرمیان.

**گەرمە سێری ، گەرمە سێریە:** گەرمە سێری.

**گەرمە شیۋەن:** گەرمە شین.

**گەرمە گلێ:** گەنمە گردی. بە پەلە و یەك لەسەر یەك.

**گەرمە گۆڕ:** گەرمەگۆڕ.

**گەرمە گۆڕ بی یەی:** بە گەرمە گۆڕ بوون.

**گەرمە گۆڕ کریای:** بە گەرمە گۆڕ کران.

**گەرمە گۆڕ کەرژەی:** بە گەرمە گۆڕ کردن.

**گەرمە گوو:** گوویەك کە خێرا بێتە دەرێ و بکرێ.

**گەرمە وون:** گەرمە خوێن. تازە کوژرانی مرۆڤ.

**گەرمی:** گەرمی. گەرما.

**گەرمیان:** گەرمیان.

**گەرمیانەرە:** بە گەرمیاندا بەرەو خوار.

**گەرمیانەنە:** لە گەرمیاندا.

**گەرمیانی ، گەرمیانیە:** گەرمیانی.

**گەرمی پیم:** گەرمی پێو.

**گەڕ نیس ، گەڕ نیسە:** گەڕۆڵ. پیس و پۆخڵ.

**گەڕ و گوڕ:** گەڕ و گوڕ. فێڵ و تەڵەکە.

**گەڕ و گوڕ باز ، گەڕ و گوڕ بازە:** تەڵەکە باز.

**گەڕ و گوڕ بازی:** تەڵەکە بازی.

**گەڕ و گوڕ کەر ، گەڕ و گوڕ کەرە:** تەڵەکە باز.

**گەڕ و گوڕ کەرڎەی:** تەڵەکە بازی.

**گەڕ و گومەڵ:** گەڕ و گوڕ. فێڵ و تەڵەکە.

**گەڕ و گومەڵ کەر ، گەڕ و گومەڵ کەرە:** تەڵەکە باز.

**گەڕ و گومەڵ کەرڎەی:** تەڵەکە بازی.

**گەڕ و گیچەڵ:** گەڕ و گیچەڵ.

**گەڕۆڵ ، گەڕۆڵە:** گەڕۆڵ.

**گەڕۆڵ بی یەی:** گەڕۆڵ بوون.

**گەڕۆڵ کریای:** کەرۆڵ کران.

**گەڕۆڵ کەرڎەی:** گەڕۆڵ کردن.

**گەڕۆڵی:** گەڕۆڵی.

**گەرە:** گێرە. کوتانی خەرمان بە وڵاغ.

**گەرە:** فێڵ. ڕیزی چنراوی کلاش.

**گەرە شێل:** پێ شێل. شێلانی شت بە پێ.

**گەرە شێل کەرڎەی:** پێ شێل کردن.

**گەرەك:** گەرەك. ویست.

**گەرەك بی یەی:** ویستن. حەز لێ کردن.

**گەرە کریا ، گەرە کریێ:** گێرە کراو.

**گەرە کریای:** گێرە کران. شێلران.

**گەڕەکە:** گەڕەك.

**گەرە کەر ، گەرە کەرە:** گێرە کەر.

**گەرە کەڎەی:** گێرە کردن. شێلان.

**گەڕەلاوژێ:** گەڕەلاوژە.

**گەرە و کێشە:** گێرە و کێشە.

**گەرە و لەقا:** گێرە بە لەقە؛ جۆرە لێندانێکە.

**گەری:** گەری؛ پاشگری پیشە نیشاندان.

**گەڕی:** گەڕی. گەڕۆڵی.

**گەڕیڎە ، گەڕیڎێ:** گەڕیدە.

**گەڕیڎەیی:** گەڕیدەیی.

**گەڕیلە ، گەڕیلێ:** گەڕۆڵی بچکۆلە.

**گەڕیلەیی:** بچکۆلەیی و گەڕۆڵی شت.

**گەڕیەتی:** گەڕۆڵی. گەڕۆڵێتی.

**گەڕیی:** گەڕیی. گەڕۆڵی.

**گەزاف:** گەزاف. خۆ هەڵکێشان و درۆی زل.

**گەزاف وَنە دای:** گەزاف لێدان.

**گەزاف وەنە دای:** گەزاف لێدان.

**گەزتەی:** گەزتن.

**گەزتەینە:** گاز لێ گرتن.

**گەزتەیۆ:** گەزتنەوە.

**گەزتەیەنە:** گاز لێ گرتن.

**گەز گەرڎەی:** گەز کردن.

**گەزگەز:** گەز بە گەز.

**گـەزگـەزبـالآ کـەرڎەی:** گـەز بـە گـەز بـالآ کردن.

**گەزنڎە ، گەزنڎێ:** گەزندە.

**گەزننە ، گەزننێ:** گەزندە.

**گەزۆ:** گەزۆ.

**گەزۆ باڵی:** گەزی بە قەدەر باڵ درێژ.

**گەزۆ حەڵەبی:** گەزی حەڵەب.

**گەزۆ شای:** گەزی شا.

**گەزە:** گەزی پێوانە کردن. مەتر.

**گەزە گەزە:** وتەیەکە بـە منـاڵ ئـەوترێت بـە واتای: ئادەی گاز بگرە.

**گەزەنێ:** گیای گەزگەزۆك.

**گەزیا ، گەزیێ:** گەزراو. گاز لێگیراو.

**گەزیای:** گەزیان. گاز لێ گیران.

**گەزیزە:** گەزیزە.

**گەژ ، گەژە:** گەش.

**گەژکریایۆ:** گەش کرانەوە.

**گەژکەرڎەیۆ:** گەش کردنەوە.

**گەژیۆنایۆ:** گەشاندنەوە.

**گەژیۆیایۆ:** گەشانەوە.

**گەستەی:** گەستن. گەزتن.

**گەستەیۆ:** گەستنەوە. گەزتنەوە.

**گەستەیەنە:** **لە** گەستندا. لە گەزتندا.

**گەش ، گەشە:** گەش.

**گەش ئەوۆە بی یەی:** گەش بوونەوە.

**گەش ئەوۆە کریای:** گەش کرانەوە.

**گەش ئەوۆە کەرڎەی:** گەش کردنەوە.

**گەش بی یەیۆ:** گەش بوونەوە.

**گەشت:** گەشت.

**گەشتکەر ، گەشتکەرە:** گەشتکەر.

**گەشت کەرڎەی:** گەشت کردن.

**گەشتنامە:** گەشتنامە.

**گەشت و گوزار:** گەشت و گوزار.

**گەشتیار ، گەشتیارە:** گەشتیار.

**گەشتیاری:** گەشتیاری.

**گەش کریایۆ:** گەش کرانەوە.گەکە: گەشکە. دەردە کۆپان.

**گەشکە:** گەشکە.

**گەشکە کەرڎەی:** گەشکە کردن.

**گەشکە کەرڎەیۆ:** گەشکە کردنەوە.

**گەشکە گرتەی:** گەشکە گرتن.

**گەشنایۆ:** گەشاندنەوە.

**گەشۆ بی یەی:** گەشەو بوون.

**گەشۆ کریای:** گەشەو کران.

**گەشۆ کەرڎەی:** گەشەو کردن.

**گەشە:** گەشە. کەیف و خۆشی.

**گەشە کەرڎەی:** گەشە کردن.

**گەشـــە گرتـــەی:** گەشـــە گـــرتن. کـــەیف و خۆشبوون.

**گەشی:** گەشی.

**گەشیایۆ:** گەشانەوە.

**گەشیەنە:** لە گەشیدا.

**گەف:** گەپ. گاڵتە.

**گەفای:** وەڕین.

**گەفایەنە:** لە وەڕیندا.

**گەف کەرڎەی:** گەپ کردن.

**گەفە:** گەفە. حەپە.

**گەفە گەف:** حەپە حەپ.

**گەل:** گەل. کۆمەڵ.

**گەڵ: گەڵ**. ناو لنگ.

**گەڵا:** گەڵا.

**گەڵا ئەرە ڕێزای:** گەڵا داوەرین.

**گەڵا ئەرە ڕێزنای:** گەڵا داوەراندن.

**گەڵا ئەرە کۆای:** گەڵا داکوتاندن.

**گەڵابە:** گەڵابە.

**گەڵا بەردای:** گەڵا دەردان. گەڵا کردن.

**گەڵاخەزان:** گەڵاخەزان.

**گەڵا ڎار ، گەڵا ڎارە:** گەڵا دار.

**گەڵا ڕن ، گەڵا ڕنە:** گەڵا ڕن.

**گەڵا ڕنیەی:** گەڵا ڕنین.

**گەڵا ڕنیەیرە:** گەڵا دارنین.

**گەڵا ڕنیەیەرە:** گەڵا دارنین.

**گەڵا ڕێزان:** گەڵا ڕێزان.

**گەڵا ڕێزای:** گەڵا وەرین.

**گەڵا ڕێزایرە:** گەڵا داوەرین.

**گەڵا ڕێزایەرە:** گەڵا داوەرین.

**گەڵا ڕێواسی:** توولە ترش.

**گەڵاسی:** گڵاسی؛ چەرمی نەرمی ڕەنگ کراو.

**گەڵا کوت:** گەڵا کوت. تێلای گەڵا وورد کردن.

**گەڵا کەرڎەی:** گەڵا کردن.

**گەڵا گەڵا:** شتی ناسکی گەڵا ئاسا. سیفەتی نانی هۆرامی یە. گەڵا گەڵا. گەڵا.

**گەڵا و گەڵ:** گەڵا و گەڵ.

**گەلاوێژ:** گەلاوێژ.

**گەلاوێژی ، گەلاوێژیە:** گەلاوێژی.

**گەل پرس ، گەل پرسە:** گەل پەرست.

**گەل پرسی:** گەل پەرستی.

**گەل پەرۆەر ، گەل پەرۆەرە:** گەل پەروەر.

**گەل پەرۆەری:** گەل پەروەری.

**گەل دۆس ، گەل دۆسە:** گەل دۆست.

**گەل دۆسی:** گەل دۆستی.

**گەلکاری:** گەلکاری. کارکردنی بە کۆمەڵ.

**گەل کەرڎەی:** کارکردن. بە شێوەی کۆمەڵ.

**گەڵگمێز:** گەڵمیز.

**گەڵ گەنا ، گەڵ گەنێ:** گەڵ گەنیو.

**گەڵ گەنای:** گەڵ گەنین.

**گەڵ و سمت:** گەڵ و سمت.

**گەڵ و قنگ:** گەڵ و قنگ.

**گەڵ و کوس:** گەڵ و قوز.

**گەڵ و گون:** گەڵ و گون.

**گەڵ و گیپاڵ:** گەڵ و گیپاڵ.

**گەڵ و گیفال:** گەڵ و گەدە.

**گەلە:** ران. کۆمەڵێکی زۆر لە حەیوان.

**گەلە بز:** رانی بزن. بزن گەل.

**گەلە بێرە:** چوون بۆ ناو ڕان بۆ ئاژەڵ دۆشین.

**گەلە تف:** چینەوەی توو بە هەرەوەز.

**گەلە جمای:** هەڵساندن و خستنە ڕێی ڕان.

**گەلە خان:** گەلە خان.

**گەلە درەوۆ:** گەلە درەو.

**گەلە زیای:** چوونە دەرەوەی ڕان لە گەووڕ.

**گەلە شەتڵ:** شەتڵ ناشتنی بە کۆمەڵ.

**گەلە کۆمە:** گەلە کۆمە. گەلە کۆمەك.

**گەلە کۆمکەر ، گەلە کۆمکەرە:** گەلە کۆمەکەر.

**گەلە کۆمە کەرڎەی:** گەلە کۆمەك کردن.

**گەڵە گەڵ:** گەلا و گەڵ.

**گەلە لۆ:** گەلی بڕینی گیای لۆ.

**گەلە لۆای:** چوونە دەرەوەی ڕان لە دێ.

**گەلە مەی:** ڕانە مەڕ.

**گەلە ۆەرگ:** گەلە گورگ.

**گەلە هیت:** گەلە جووت.

**گەلە هێزم:** گەلە دار.

**گەڵێ:** گەڵ.

**گەلێ:** گەلی. دەربەند.

**گەمارۆ:** گەمارۆ.

**گەمارۆ دای:** گەمارۆ دان.

**گەمارۆ دریای:** گەمارۆ دران.

**گەماڵ:** گەماڵ؛ سەگی نێر.

**گەمرە بەستەی:** گەمرە بەستن.

**گەمرێ:** گەمرە. توێژی چڵك و کرێش.

**گەمە:** گەمە. گاڵتە. یاری.

**گەمە پنە کەرڎەی:** گاڵتە پێ کردن.

**گەمە پەنە کەرڎەی:** گاڵتە پێ کردن.

**گەمە چنی کەرڎەی:** گاڵتە لەگەڵ کردن.

**گەمە چەنی کەرڎەی:** گەمە گاڵتە لەگەڵ کردن.

**گەمە کەر ، گەمە کەرە:** یاریکەر.

**گەمە کەرڎەی:** یاری کردن.

**گەمە گا:** یاریگا. یاریگە.

**گەمە گەمالێ:** یاری کردن.

**گەمی:** گەمی. کەشتی.

**گەمیەوان ، گەمیەوانە:** گەمیەوان.

**گەمیەوانی:** گەمیەوانی.

**گەن ، گەنە:** گەند. پیس.

**گەنا ، گەنێ:** گەنیو.

**گەنای:** گەنین.

**گەنج ، گە نجە:** گەنج. لاو.

**گە نجایەتی:** گەنجایەتی.

**گە نجایەتی یەنە:** لە گەنجایەتیدا.

**گەنج ئەوۆە بی یەی:** گەنج بوونەوە.

**گەنج ئەوۆە کریای:** گەنج کرانەوە.

**گەنج ئەوۆە کەرڎەی:** گەنج کردنەوە.

**گەنج بی یەیۆ:** گەنج بوونەوە.

**گەنج کریایۆ:** گەنج کرانەوە.

**گەنج کەرڎەیۆ:** گەنج کردنەوە.

**گە نجۆ بی یەیۆ:** گەنجەوە بوون.

**گە نجۆ کریای:** گەنجەو کران.

**گە نجۆ کەرڎەی:** گەنجەو کردن.

**گه نجه‌فه :** گه‌نجه‌فه. تیتالّی.

**گه نجی :** گه‌نجی. لاوی.

**گه نجینه : گه نجینه**. ژووری زه‌خیره.

**گه نجینه‌ۋان ، گه نجینه‌ۋانه :** گه‌نجینه‌وان.

**گه نجینه‌ۋانی :** گه‌نجینه‌وانی.

**گه نجیه‌تی :** گه‌نجێتی.

**گه‌نڎ ، گه‌نڎه :** گه‌ند.

**گه‌نڎاۋ :** زه‌لکاو. ئاوی که‌مى پیس. گه‌نگاو.

**گه‌نڎ و گوو :** گه‌ند و گوو.

**گه‌نڎه پـه‌ڵه :** گه‌نده پـه‌ڵه.

**گه‌نڎه پیا :** گه‌نده پیاو. پیاوی نامه‌رد.

**گه‌نڎه ده‌س ، گه‌نـڎه ده‌سه :** که‌سێ کـه دزی بکات له شتی دیاری کراو.

**گه‌نڎه ژه‌نی :** گه‌نده ژن. ژنی ناپاك.

**گه‌نڎه‌ڵ :** گه‌نده‌ڵ.

**گه‌نڎه‌ڵی :** گه‌نده‌ڵی.

**گه‌نڎه موو :** گه‌نـده مـوو. مـووی لاوازی تـازه ده‌رهاتوو.

**گه‌نڎه‌وه‌ر ، گه‌نڎه‌وه‌ره :** گه‌نده‌خۆر.

**گه‌نڎه‌وه‌ری :** گه‌نده‌خۆری.

**گه‌نڎه یاۋ :** گه‌نده تا.

**گه‌نگاۋ :** گه‌نگاو.

**گه نم دره‌ۋ :** گه‌نم دره‌و.

**گه نم ڕه‌نگ ، گه نم ڕه‌نگه :** گه‌نم ڕه‌نگ.

**گه نم ڕه‌نگی :** گه‌نم ڕه‌نگی.

**گه نم گه نم :** گه‌نم گه‌نم؛ ناوی یاری یه‌که.

**گه نمه :** گه‌نم.

**گه نمه قه‌نڎه هاری یه :** گه‌نمه قه‌نده‌هاری.

**گه نمه قه‌ننه هاری یه :** گه‌نمه قه‌نده‌هاری.

**گه نمه کۆیسانی یه :** گه‌نمه کوێستانی.

**گه نمه ۋه‌هارێ :** گه‌نمه به‌هاره.

**گه نمین ، گه نمینه :** نان و کولێره‌ی گه‌نم.

**گه‌نناى :** گه‌نانده‌ن.

**گه‌نن و گوو :** گه‌ند و گوو.

**گه‌ننه پـه‌ڵه :** گه‌نده پـه‌ڵه.

**گه‌ننه پیا :** گه‌نده پیاو. پیاوی ناپاك.

**گه‌ننه ژه‌نی :** گه‌نده ژن. ژنی ناپاك.

**گه‌ننه‌ڵ ، گه‌ننه‌ڵه :** گه‌نده‌ڵ.

**گه‌ننه‌ڵی :** گه‌نده‌ڵی.

**گه‌ننه موو :** گه‌نده موو.

**گه‌ننه‌وه‌ر ، گه‌ننه‌وه‌ره :** گه‌نده خۆر.

**گه‌ننه‌وه‌ری :** گه‌نده خۆری.

**گه‌ننه یاۋ :** گه‌نده تا.

**گه‌ننی :** گه‌ندی. پیس و پۆخڵی. نا پاکی.

**گه‌نه که‌ۋه‌لێ :** گه‌نه که‌وه‌له.

**گه‌نێ :** گه‌نه.

**گه‌ۋا ، گه‌ۋێ :** شایه‌ت، شاهید،

**گه‌ۋاڎ ، گه‌ۋاڎه :** گه‌واد.

**گه‌ۋاڎ خانه :** گه‌واد خانه.

**گه‌ۋاڎی :** گه‌وادی.

**گه‌ۋاڎیکه‌ر ، گه‌ۋاڎیکه‌ره :** گه‌وادیکه‌ر.

**گه‌ۋاڎی که‌رڎه‌ی :** گه‌وادی کردن.

**گه‌ۋاڵ :** گه‌واڵ. ده‌سته. تاقم.

**گه‌ۋاڵ گه‌واڵ :** گه‌واڵ گه‌واڵ. ده‌سته ده‌سته.

**گەوڤاە ، گەوڤاهە :** شایەت. شاهید.

**گەوڤاهنامە :** گەوانامە. بڕوانامە.

**گەوڤاهی :** گەواهی. شایەتی. شاهیدی.

**گەوڤاهی دای :** گەواهی دان. شایەتیدان.

**گەوڤاهیدەر ، گەوڤاهیدەرە :** شایەتیدەر.

**گەوڤایی :** شایەتی. شاهیدی.

**گەوڤایی دای :** شایەتیدان. گەواهیدان.

**گەوج ، گەوجە :** گەوج.

**گەوجانە :** گەوجانە. نەزانانە.

**گەوجە گەوج :** گەوجە گەوج. قسە کردنی گەوجانە.

**گەوجی :** گەوجی.

**گەوجیەتی :** گەوجێتی. گەوجی.

**گەوڕ :** گەووڕ. پشتیر.

**گەوڕۆری :** بە گەووڕا بەرەو ژوور.

**گەورە ، گەورێ :** گەورە.

**گەورە بی یەی :** گەورە بوون.

**گەورە پێ :** پێڵاوی پێی گەورە.

**گەورە پیا :** پیاوی گەورە.

**گەورە دەگا :** گەورە دێ.

**گەورە ژەنی :** گەورە ژن.

**گەورە شار :** گەورە شار.

**گەورە کریای :** گەورە کران.

**گەورە کناچێ :** گەورە کچ.

**گەورە کوڕ :** گەورە کوڕ.

**گەورە کەرذەی :** گەورە کردن.

**گەوڕەنە :** لە گەوڕدا.

**گەورە یانە :** گەورە ماڵ.

**گەورەیی :** گەورەیی.

**گەورەییەنە :** لە گەورەییدا. بە گەورەیی.

**گەوهەر :** گەوهەر.

**گەوهەر ئەشناس ، گەوهەر ئەشناسە :** گەوهەر ناس.

**گەوهەر ئەشناسی :** گەوهەر ناسی.

**گەوهەربار ، گەهورباره :** گەوهەربار.

**گەوهەر شناس ، گەوهەر شناسە :** گەوهەر ناس.

**گەوهەر شناسی :** گەوهەر ناسی.

**گەوهەر ۆرەش ، گەوهەر ۆرەشە :** گەوهەر فرۆش.

**گەوهەر ۆرەشی :** گەوهەر فرۆشی.

**گەهان :** چاوەڕوان کراو. زانراو.

**گەی :** ڕێبازی حەیوانی کێوی. پەڵپ.

**گەیا ، گەیێ :** گەیاو. گەیاگ.

**گەیای :** گەیان. گاندان.

**گەی گرتەی :** پەڵپ گرتن.

**گەیگە :** حەشارگەی ڕاوی حەیوانی کێوی.

**گەی گیر ، گەی گیرە :** پەڵپگر.

**گێ :** ناوی پیتی (گ). ئەبوو. ئەبووایە. پاشگرێکە دەچێتە سەر هەندێ ناو و ئەیکات بە بکەر. وەك: ((هەرگێ)).

**گیان :** گیان.

**گیانالاوە :** گیانەلاو.

**گیان ئەسپارای:** گیان سپاردن. مردن.

**گیان ئێشای:** هاتنە ئێشی سەراپای لەش.

**گیانبـاز ، گیانبـازە:** کەسـێك کـە کـارێکی مەترسیدار ئەکات. (المغامر).

**گیانبازی:** گیان خستنە مەترسی یەوە.

**گیان بۆژار:** گیان بووژێنەوە.

**گیان بەخش ، گیان بەخشە:** گیان بەخش.

**گیان بە دەس:** خوای گەورە.

**گیان بەر ئارژەی:** گیان دەرهێنان.

**گیان بەر ئامای:** گیان دەرهاتن.

**گیان بەر ئاوۆرژەی:** گیان دەرهێنان.

**گیان بەر شی یەی:** گیان دەرچوون.

**گیان بـەر کـەرژەی:** گیـان دەرکـردن. خـۆ لـە مەرگ قوتار کردن.

**گیان بـی یـەی مـل:** گیـان بوونـە مـل. وەڕس بوون لە ژیانی خۆ.

**گیاندار ، گیاندارە:** گیاندار.

**گیان دای:** گیان دان. گیان دەرچوون.

**گیان دای دەسۆ:** گیان بە دەستەوە دان.

**گیان سەخت ، گیان سەختە:** گیان سەخت.

**گیان سەختی:** گیان سەختی.

**گیان شیرین ، گیان شیرینە:** کەسێك کە گیان و ژینی خۆی زۆر خۆش دەوێ.

**گیان شیرینی:** زۆر خۆش ویستنی گیان.

**گیـــان قـــورس ، گیـــان قورســـە:** تەمـــەڵ. تەوەزەل.

**گیان قورسی:** تەمەڵی. تەوەزەلی.

**گیان کۆتەیناوۆ:** گیان تێ کەوتنەوە.

**گیان کۆتەینە:** گیان تێ کەوتن.

**گیان کەنشت:** گیان کەنشت.

**گیان کەنشت کەرژەی:** گیان کەنشت کردن.

**گیان کەنشتەنە:** لە گیان کەنشتدا.

**گیانکێش:** گیانکێش. فریشتەی گیان کێشان.

**گیان کێشای:** گیان کێشان.

**گیان کێشتەی:** گیان کێشان.

**گیانگا:** شوێنی گیان لە لەشدا.

**گیانگە:** شوێنی گیان لە لەشدا.

**گیانەکەم لەیل:** ناوی جۆرێکە سیاچەمانە.

**گیانەلاۆی:** گیانەلاو.

**گیانەوەر:** گیانەوە. گیانلەبەر.

**گیــان وەشــەوێس ، گیــان وەشەوێــسە:** گیـان خۆشەویست.

**گیانی گیانی ، گیانی گیانیە:** گیانی. بریتـی یـە لـە دۆسـتی ڕاسـتەقینە و یـەك ماڵیی.

**گیبلە:** تۆوی گیای لۆ.

**گیپاڵ:** وورگ. سکی زل.



**گیپە خانە:** گیپی خانە.

**گیپە خانەنە:** لە گیپە خانەدا.

**گیپەڕێ:** گیپەڕە. ئەستوورایی مل.

**گیپێ:** گیپە.

**گێتـــە چـــەربێ:** گێتکـــە چـــەورە. کـــولێرە چەورە.

**گێتە خانە:** گێتکە خانە. کولێرە خانە.

**گێته کەرڎەی:** گێتکه دروست کردن.

**گێتـه مـەژگێ:** گێتکـەی ئـاخنـراو بـه کاکڵـه گوێزی هاڕدراوه.

**گێتێ:** کولێرەیەکی خڕی بچووکە. گێتکه.

**گێج ، گێجه:** گێژ. سووڕ. خول. گێژی ئاو.

**گێجاوَه:** گێژاو. گێجاو. مەینەت و مەرارەت.

**گێج بی یەی:** گێژ بوون.

**گێج دای:** گێژ دان. سووڕ دان. خول دان.

**گێج کەرڎەی:** گێژ کردن.

**گێجنای:** گێژ دان. سووڕ دان.

**گێج وارڎەی:** گێژ خواردن.

**گێجەڵۆکە:** گێژەڵۆکە.

**گێجەنێ:** گێژەنە. بن ڕێسمە.

**گێجی:** کێژی. ووڕی. گێجی.

**گێجیا ، گێجیێ:** گێژ بووگ. ووڕ بووك.

**گێجیای:** گێژ بوون. ووڕ بوون.

**گێچکە:** منەت. بادانەوە.

**گێـچە کـەرڎەی:** منـەتبار بـوون. بادانـەوە. چەرخە و خول خواردن.

**گێـچەڵ ئەنـه پیتـەی:** تەشـقەڵە پـێ کـردن. گێچەڵ تێ پێچان.

**گێچەڵباز ، گێچەڵبازە:** تەشقەڵە باز.

**گێچەڵبازی:** تەشقەڵە بازی. گێچەڵبازی.

**گێچەڵ بە فتنگ ، گێـچەڵ بـە فتنگـە:** گێـچەڵ بە فتنگ.

**گێچەڵ بە فتنگی:** ئاژاوە گێڕی. تەشقەڵە بازی.

**گێـچەڵ تێـك دای:** ئـاژاوە شـێواندن. گێـچەڵ تێکدان.

**گێچەڵ شێوَنـای:** ئاژاوە شێواندن.

**گێچەڵ گێڵنـای:** ئاژاوە گێڕان.

**گێچەڵ نیایوَ:** ئاژاوە نانەوە.

**گێـــچەڵ وَرەش ، گێـــچەڵ وَرەشـــه:** گێـــچەڵ فرۆش. تەشقەڵە کردن.

**گێـــچەڵۆنیای:** ئـــاژاوە نانـــەوە. تەشـــقەڵە دروست کردن.

**گێچەڵە:** گێچەڵ. گەڕ. تەشقەڵە.

**گێر ، گێرە:** گیر. ڕژد. جیڕ.

**گێڕ ، گێڕە:** گێڕ. لار و ناڕاست. پاشگری بـه واتا بکەر.

**گێر ئارڎەی:** بە گیر هێنان.

**گێر ئامای:** بە گیر هاتن.

**گێر ئاوَرڎەی:** بە گیر هێنان.

**گێرا:** گیرا. قەبووڵ بوونی دوعا.

**گێرا بی یەی:** گیرا بوون. قەبووڵ بوون.

**گێرا کەرڎەی:** گیرا کردن.

**گێرام:** گریمان. کردمان. وام دانا.

**گێر ئەنه بی یەی:** تـێ گـیر بـوون. تـێ بەنـد بوون.

**گێر ئەنه کریای:** تێ گیر کران.

**گێر ئەنه کەرڎەی:** تێ گیر کردن.

**گێر بی یەی:** گیر بوون.

**گێر بی یەینه:** تێ گیر و بەند بوون.

**گێرتەی:** گرتن بە هەموو لق و پۆپەکانی یەوە.

**گیر دای:** گیر دان. به گیر هێنان.
**گیر کرتەی:** گەوتنە گیر. گەوتنە چنگ.
**گیر کەرڎەی:** گیر کردن. بەند کردن.
**گێڕ کەرڎەی:** گێڕ کردن. چەوت کردن.
**گیرگە:** جێگایەك کە شتی تێدا گیر بکرێت.
ئـامرازی دەرگـا داخـستن لـە جێـی پشکۆڵ. ئامرازی جۆڵایی یە.
**گیر مدرای:** بە گیر وەستان. بە گیر هاتن.
**گیرنای:** کـورت کردنـەوەی جل و بـەرگ بـە تەقـەڵ. گیرانـدن. دەسـت بـە سـەرا گرتن.
**گیر ۏارڎەی:** گیر خواردن. گیر کردن.
**گیر و بەنڎ:** لکاندن و وەستاندنی شت. قایم.
**گیر و بەنـڎ بـی یـەی:** لکانـدن و وەسـتاندنی شت. قایم بوون.
**گـیر و بەنـڎ کـەرڎەی:** لکانـدن و وەسـتاندنی شــت لــە جێگایەکــدا یــان لەســە حاڵەتێك.
**گـیر و بەنـڎ کریـای:** لکێنـران و وەسـتاندنی شــت لــە جێگایەکــدا یــان لەســە حاڵەتێك.
**گیر و دار:** گیر و دار. بگرە و بەردە.
**گیرۆڎە ، گیرۆڎێ:** گیرۆدە. گرفتار.
**گیرۆڎە بی یەی:** گیرۆدە بوون.
**گیرۆڎە کریای:** گیرۆدە کران.
**گیرۆڎە کەرڎەی:** گیرۆدە کردن.
**گیرۆڎەیی:** گیرۆدەیی. گرفتاری.

**گیر ۏزتەی:** گیر خستن. هێنانە بەردەست.
**گیر ۏستەی:** گیر خستن. هێنانە بەردەست.
**گیر و گرفت:** گیر و گرفت.
**گێڕ و گێج ، گێڕ و گێجە:** گێڕ و گێژ.
**گێڕ و گێج بی یەی:** گێڕ و گێج بوون.
**گێڕ و گێج کریای:** گێڕ و گێج کران.
**گێڕ و گێج کەرڎەی:** گێڕ و گێج کردن.
**گێڕ و گێجی:** گێڕ و گێژی.
**گیرە: گیرە:** جەڕ و مەنگەی پیشە سازان.
**گێرە:** بگرە. لەوانەیە. پێدەچێ.
**گیرەی دەسی:** مەنگەنەی بچووك.
**گیری:** گیری. جیرِی. ڕژدی. خۆ بە دەسـتەوە نەدان.
**گێڕی:** گێڕی. لاری. چەوتی.
**گێریا ، گێریێ:** گیراو.
**گێریای:** گیران.
**گێریای پنە:** پێ گیران.
**گێریای پەنە:** پێ گیران.
**گێریایرە:** داگیران.
**گێریاینە:** تێ گیران.
**گێریایۆ:** گیرانەوە.
**گێریایەرە:** داگیران.
**گێریایەنە:** تێ گیران.
**گیز:** گێز؛ ڕێشووی شەدە و مێزەر.
**گیزنای:** گیزە گیزکردن.
**گیز و گوڵەنگ:** گیز و گوڵەنگ.

**گیــزە:** گیــزە، دەنگێکــی بــارکی تیــژە وەك دەنگی فڕینــی مێشووله یــان کوڵانی ئاو و شـله لـه مەنجـەڵ و سـەماوەر و شتی وادا.

**گیزە گیز:** گیزە گیز.

**گیزە گیز کەرۋەی:** گیزە گیز کردن.

**گیزە مل:** گیزە مل. بۆق مل. پشت مل.

**گیزێ:** گیزە.

**گیزێ ملی:** گیزە مل.

**گێسك:** بەچکەی بزن لە تەمەنی سێ مانگی یەوە تا ساڵێك. گیسك.

**گێسکلێ:** گیسکی مێینەی بچووك.

**گیـسکە زا:** گیـسکە زا. ئـاوس بـوون و زاینـی بەچکەی بزن بە گیسکی.

**گێسکە موو:** مووی گیسك.

**گێــسکە مــەرەز ، گێــسکە مــەرەزە:** گیــسکە مەرەز، گیسکێکە کە مووەکـەی نـەرم بێت یانی مووەکەی مەرەز بێت.

**گیسنـاینە:** داگیرساندن.

**گیسنـایەنە:** داگیرساندن.

**گیسیـاینە:** داگیرسان.

**گیسیـایەنە:** داگیرسان.

**گیڤ:** گیف.

**گــیڤ کــەرۋەی:** گــیف کــردن. خــۆ فــش کردنەوە.

**گیڤنـای:** گیڤاندن. دەنگی تێپەڕ بوونی شتی کەمێ گەورە بە خێرایی.

**گیڤە:** گیڤە.

**گیڤە گیڤ:** گیڤە گیڤ.

**گێل ، گێلە:** گێل. گیانداری گێژ و وێژ.

**گێڵ ، گێڵە:** گەشت. سووڕ. خول. هەڵتەکان.

**گێڵا ، گێڵێ:** گەڕیدە. سووڕاو. وەرچەرخاو.

**گیلاخە:** گیلاخە.

**گیلاغە:** گیلاخە.

**گێلاس:** گێلاس.

**گێلاســی ، گێلاســیە:** گێلاســی. ڕەنــگ یــان هەرچی کە ڕەنگی گێلاسی بێت.

**گێڵای:** گەڕان. سووڕان. وەرچەرخان.

**گێڵایرە:** داگەڕان. تگە گرتن. سك پڕ بـوونی مەڕ و بزن.

**گێڵاینە:** لە گەڕاندا. لە سووڕاندا.

**گێڵایۆ:** گەڕانەوە. وەرچەرخانەوە.

**گێڵایەرە:** ئاوس بوونی مەڕ و بزن.

**گێڵایەنە:** لە گەڕاندا. لە سووڕاندا.

**گێل بی یەی:** گێل بوون. حۆل بوون.

**گێڵ دای:** گێژ دان. سووڕ دان. خول دان.

**گێڵ دریـای:** سووڕ دران. خول دران.

**گێل کەرۋەی:** گێل کردن.

**گێلگێلە:** گێلگێلە.

**گێڵنـای:** گەڕاندن. سووراندن.

**گێڵنـایرە:** ئاوس کردنی مەڕ و بزن.

**گێڵنـاینە:** لە گەڕاندا. لە سووڕاندا.

**گێڵنـایۆ:** گێڕانەوە. گەڕاندنەوە.

**گێڵنـایەرە:** ئاوس کردنی مەڕ و بزن.

**گێڵنایەنە :** لە گەڕاندا. لە سووڕاندا.

**گێل و گاوٚار ، گێل گاوٚارە:** حۆل. بلّج. گێـل و گەمژە.

**گێل و گاوٚاری:** گێلی و گەمژەیی. بلّحی.

**گێلە ، گێلیْ:** یارۆی گێل.

**گێلە پیا :** گێلە پیاو.

**گێلە کناچیْ:** گێلە کچ.

**گێلە کوڕ:** گێلە کوڕ.

**گێلی:** گێلی. بلّحی. حۆلی.

**گێڵیار ، گێڵیارە:** گەشتیار. گەڕیدە.

**گێڵیاریی:** گەشتاریی. گەڕیدەیی.

**گیوٚاوٚ:** گیا.

**گیـوٚاوٚ ئـەوٚە ڕووتنـــای:** گیـا ڕووتاندنـــەوە. دەسکەنە کردنی گیا.

**گیوٚاوٚ بڕ:** کاتی گیا و گزرە بڕین.

**گیوٚاوٚ پڕای:** کاتی پووشپەڕ. پەڕینی گیا.

**گیوٚاوٚ ڕووتنایوٚ:** دەسکەنە کردنی گیا.

**گیوٚاوٚ کەن ، گیوٚاوٚ کەنە :** گیا بڕ.

**گیوٚاوٚ کەنڎەی:** گیا بڕین.

**گیوٚاوٚ کەننەی:** گیا بڕین.

**گیوٚاوٚ گەنڎان :** گیا گەنان.

**گیوٚاوٚ گەننان :** گیا گەنان. مانگی مایس.

**گیوٚاوٚڵــە :** گیــای وردی تــازە دەرهــاتوو لــە زەوی.

**گیوٚاوٚڵە کەنڎەی:** هەڵکەندنی گیای ورد.

**گیوٚاوٚڵە کەننەی:** هەڵکەندی گیای ورد.

**گیوٚاوٚوٚ ڕووتنای:** دەسکەنەی گیا.

**گیوٚاوٚە بوٚ گولە :** گیا بۆگەنە.

**گیوٚاوٚە جاڕ:** گیا جاڕ. مێرگ.

**گیــوٚاوٚە ڕەنگیلــە :** گیــا ڕەنــگ؛ گیایەکــە بــۆ ڕەنـگ کردنـی رانـك و چـۆغە بـەکار دەهێنرێت.

**گیوٚاوٚە کەڵە :** گیا کەڵە.

**گیوٚاوٚ وەر ، گیوٚاوٚ وەرە:** گیا خۆر.

**گیوٚەی:** گیوە؛ جۆرێکی نایابە لە کڵاشی ژێـر پەڕۆین.

**گیــوٚەی چــن ، گیــوٚەی چــنە :** وەســتای کڵاشـی گیوە کە سەرەکەی دەچنێ.

**گیوٚەی چنیەی:** چنینی کڵاشی گیوەیی.

**گیــوٚەی کــەر ، گیــوٚەی کــەرە:** وەســتای ژێــرە کڵاشی گیوەیی.

**گیوٚەی کەرڎەی:** دروست کردنی ژێـرە کڵاشـی گیوەیی.

* * *

# ل

## پیتی لیْ (ل)

**ل:** ل؛ پیتێکه له پیتەکانی زمانەکەمان.

**لا:** لا. لاچۆ. تەنشت. نیوەی شت. کن.

**لا ئازتەیره:** راکشان لەسەر تەنیشت.

**لا ئازتەیەره:** راکشان لەسەر تەنیشت.

**لا ئاستەیره:** راکشان لەسەر تەنیشت.

**لا ئاستەیەره:** راکشان لەسەر تەنیشت.

**لا ئامای:** هاتنە لا.

**لا ئەره ئازتەی:** راکشان لەسەر تەنیشت.

**لا ئەره ئاستەی:** راکشان لەسەر تەنیشت.

**لا ئەسانای:** لادان. کڕینی نیوەی شتێك.

**لا ئەسای:** لادان. کڕینی نیوەی شتێك.

**لا ئەنە کەرژەی:** ڕوو تێ کردن.

**لا ئەنە گێڵای:** ئەم لا و ئەو لا کـردن لـە نـاو جێگەی خەودا.

**لا ئەنە نە کەرژەی:** ڕوو تێ نەکردن.

**لا ئەنە نە گێڵای:** ئەم لاو و ئەو لا نە کـردن بە دەم خەوەوە لە ناو نوێندا.

**لا ئەوْە دای:** لادانەوە.

**لا ئەوْە دریای:** لادرانەوە.

**لا ئەوْە کەر ، لا ئەوْە کەره:** ئاوڕ دەرەوە.

**لا ئەوْە کەرژەی:** ئاوڕدانەوە.

**لابار:** لابار.

**لابار کەر ، لابار کەره:** لابار کەر.

**لابار کەرژەی:** لابار کردن.

**لاباری:** لاباری. بار بردن بە نیوەیی.

**لا بالین ، لا بالینە:** گوێ پێنـەدەر. کەسێك کـە شـتی بـەلاوە گـرنگ و پێویـست نەبێ.

**لا بـالینی:** گـوێ نـەدان بـە شـت؛ و گرنگـی نەدان بەوەی کە دەبێ گرنگیی پێ بدرێ.

**لابڕ:** لابـڕ. قـەد بـڕ. لـە ڕێ لادان بـۆ کـورت کردنەوەی ڕێگا.

**لابڕ کەرژەی:** لابڕ کردن. قەدبڕ کردن.

**لابریـا ، لابریـێ:** لابـراو. لابـراو. دوورەو خراو.

**لابریای:** لابران. دوورەو خران.

**لابلای:** لا بە لا. تەختان. تەختایی.

**لابلایی:** لا بە لایی. تەختانی. تەختایی.

**لابەر ، لابەره:** لابەر.

**لابەرژەی:** لابردن.

**لابەره:** تاکێك لە دەرگایەکی دوو تاکی.

**لاپاڵ:** لاپاڵ.

**لاپاڵۆ:** به لاپاڵەوه.

**لاپاڵوو:** لاپاڵوو. کەلەکە. خاڵیگە.

**لاپاڵەنە:** له لاپاڵدا.

**لاپلای:** لابەلا. تەختان. تەختایی.

**لاپلەر سەنگ ، لاپلەر سەنگە:** لاپلەر سەنگ. بێگانـەی خـۆ تـێ هـەڵ قـورتێن لـە کارێکدا.

**لاپلە سەنگ ، لاپلە سەنگە:** لاپلەر سەنگ.

**لاپـە قـنگ ، لاپـە قنگـە:** بـێ سـەلیقەی تەمەڵ.

**لاپە قنگی:** بێ سەلیقەیی و تەمەڵی.

**لاپواز ، لاپوازە:** لاپواز. لاپلەر سەنگ.

**لاپەڕ ، لاپەڕە:** لاپەڕ. کەنار کەوتوو.

**لاپەڕە:** لاپەڕە.

**لاپەڕە هۆر ئەۋە دای:** لاپەڕە هەڵدانەوە.

**لاپەڕە هۆر ئەۋە ۋێڵنای:** لاپەڕە وەرگێڕان.

**لاپەڕە هۆر دایۆ:** لاپەڕ هەڵدانەوە.

**لاپەڕە هۆرۆ دای:** لاپەڕ هەڵدانەوە.

**لاپەڕە هۆر ۋێڵنای:** لاپەڕە وەرگێڕان.

**لاپەڕە هۆرۆ ۋێڵنای:** لاپەڕە وەرگێڕان.

**لاپەڕی:** تاکی و کەوتنە کەنارەوە.

**لا پەی ئەۋە کەرڎەی:** ئاوڕ لێدانەوە.

**لاپەی کەرڎەیۆ:** ئاوڕ لێدانەوە.

**لات ، لاتە:** لات. گیانداری لاواز.

**لاتا:** نیوە تایەك. لای ئێوە.

**لاتانە:** لاتانە. گەدایانە. فەقیرانە.

**لاتاۋە:** بە لای ئێوەوە. بە لاتانەوە.

**لاتبـازی:** کارانێـك کـە هـەر لات ئـەنجامیان دەدات.

**لات بی یەی:** لات بوون. لاواز بوون.

**لات بی یەینە:** لە لات بووندا.

**لاتخانە:** لاتخانە.

**لات خانەنە:** لە لات خانەدا.

**لاترەك ، لاترەکە:** شتێکە کە لە لاوە ترەکی تێ بووبێت.

**لاترەك بی یەی:** لاترەك بوون.

**لاترەك کەرڎەی:** لاترەك کردن.

**لاترەکی:** ترەك بردن لە لاوە.

**لاتڕیزە:** لاتەڕیزە. لا قنگ. پاشڵ.

**لات کۆتەی:** لات کەوتن.

**لات کەوتەی:** لات کەوتن.

**لات ۋزتەی:** لات خستن.

**لات ۋستەی:** لات خستن.

**لات و لووت:** لات و لووت.

**لات و لووتی:** لات و لووتی.

**لاتۆڵە ، لاتۆڵێ:** لاتی گچکە.

**لاتەڕاف:** لاتەڕاف؛ گۆشتی تـەنکی کەلەکـەی گیاندار.

**لاتەریك ، لاتەریکە:** دوورە پەرێز.

**لاتەریکی:** دوورە پەرێزی.

**لاتەنشت:** لاتەنشت.

**لاتی:** لاتی. لاوازی ی گیاندار.

**لاتیر:** لاتیر. مۆر بوونەوە بە تیلەی چاو.

**لاتیگەری:** لاتیگەری.

**لاتی ۆرەتەی:** لاتی فرۆشی.

**لاجانگ:** لاجانگ.

**لاچاك:** پارچەی چاكی كەوا یان چۆغە.

**لاچـاڵ ، لاچـاڵە:** هەرچـی كـە لایـەكی چـاڵ بێت.

**لاچاڵی:** پێچەوانەی لا قۆقزی.

**لاچنە دای:** لا لێدان.

**لاچنە هۆر كەرڎەی:** لا لێ هەڵكردن.

**لاچەم:** لاچاو.

**لاچەنە دای:** لا لێدان.

**لاچەنە هۆر كەرڎەی:** لا لێ هەڵكردن.

**لاڎ:** تاو. سات.

**لادای:** لادن.

**لا ئەوۆە دای:** لا دانەوە.

**لا ئەوۆە دریای:** لا درانەوە.

**لادایۆ:** لادانەوە.

**لادایەنە:** لە لادانـدا.

**لادڕ:** لادڕ.

**لادڕ كریا ، لادڕكریێ:** لادڕ كراو.

**لادڕ كریای:** لادڕ كران.

**لادڕ كەر ، لادڕ كەرە:** لادڕ كەر.

**لادڕ كەرڎەی:** لادڕ كردن.

**لادریا ، لادریێ:** لاراو.

**لادریای:** لادران.

**لادریایۆ:** لادرانەوە.

**لا دڕیا ، لا دڕیێ:** لادڕاو.

**لا دڕیای:** لا دڕان.

**لا دڕیەی:** لا دڕن.

**لادەر ، لادەرە:** لادەر.

**لاڎەس:** پێنـج دانە لە شتێك.

**لاڎەسێۆ:** یەپێنج دانە لە شتێك.

**لا دەگا:** لادێ.

**لادەكانە:** لە لادێدا.

**لادەگاوۆ:** لە لاێوە.

**لادەگایانە ، لادەگایانێ:** لادێیانە.

**لادەگایی ، لادەگاییە:** لادێیی.

**لار ، لارە:** لار. ناڕاست لە مامەڵەدا.

**لاڕ ، لاڕە:** لەخۆ بایی. بادی هەوا.

**لاڕا ، لاڕێ:** ڕێگەی تەسك و بچووك.

**لاڕان:** لاڕان.

**لارای:** لارایی. لاری.

**لارایی:** لارایی. لاریی.

**لار ئەوۆە بی یەی:** لار بوونـەوە.

**لار ئەوۆە كریای:** لار كرانەوە.

**لار ئەوۆە كەرڎەی:** لار كردنەوە.

**لار بی یەی:** لار بوون.

**لاڕ بی یەی:** لەخۆبایی بوون.

**لار بی یەیۆ:** لار بوونەوە.

**لار كریای:** لار كران.

**لار كریایۆ:** لار كرانەوە.

**لار كەرڎەی:** لار كردن.

**ۆەرزن ، ۆەرزنە:** راهێنەر.

**ۆەرزنای:** راهێنان.

**ۆەرزی ، ۆەرزیە:** وەرزی. فەسڵی.

**ۆەرزیا ، ۆەرزیێ:** راهێنراو.

**ۆەرزیای:** راهێنران. خۆر هەڵهات. خۆر هەڵهاتن.

**ۆەرزین:** بەرزین.

**ۆەرزیەر ، ۆەرزیەرە:** وەرزێر.

**ۆەرزیەری:** وەرزێری.

**ۆەرسمێڵ:** بەرسمێڵ.

**ۆەر شاش ، ۆەر شاشە:** بەر تەنك.

**ۆەر شاشی:** بەر تەنکی.

**ۆەرشەق ، ۆەرشەقە:** بەرشەق.

**ۆەرشەقی:** بەرشەقی. ژیانی بەرشەقی.

**ۆەرشەو:** وەرشەو. وەرشاو.

**ۆەرشەی:** یەکەم شەی یان یەکەم شی کردنەوەی مەرەز و خوریی و شتانی لەو بابەتە.

**ۆەر شی یەی:** کار ڕۆیین بە ئاسانی. کار لەبەر چوون.

**وەرعە:** وەرع؛ خۆپاراستن لە حەرام.

**ۆەرقوڵ:** بەرکوڵ.

**ۆەرقوڵکەر ، ۆەرقوڵکەرە:** بەرکوڵکەر.

**وەرقوڵ کەرذەی:** بەرکوڵ کردن.

**ۆەرقوڵی:** بەرکوڵی.

**ۆەرکاچ:** بەردەم پەناگا. بەردەم ئەشکەوتی بچکۆلە.

**ۆەرکار ، ۆەرکارە:** بەرکار. کارکەری تازە پێگەیشتوو.

**ۆەرکاری:** بەرکاری. تازە پێگەیشتن لە کاردا.

**ۆەرکاریەنە:** لە بەرکایدا.

**ۆەرکان:** بەرکان.

**ۆەرکاۆ:** بەرکاو.

**ۆەر کریا ، ۆەر کرییێ:** لەبەر کراو.

**ۆەر کریای:** لەبەر کران. ((**تحفیظ**)).

**ۆەرکۆ:** بەرکوت.

**ۆەرکۆت ، ۆەرکۆتە:** پێشەنگ. پێش کەوتوو.

**ۆەرکۆتەی:** بەرکەوتن.

**وەر کۆتەی:** خۆر کەوتن.

**ۆەرکەر ، ۆەرکەرە:** لەبەرکەر. ((**حافظ**)).

**ۆەر کەرذەی:** لەبەر کردن.

**ۆەر کەرذەینە:** لە لەبەر کردندا.

**ۆەرکەڵە:** نێونی بەرکەڵ. نێونگی بەرکەل.

**ۆەرکەمەر:** گیایەکی بەهاری گەڵا وردی گوڵ زەردی بۆن خۆشە. گیابەند.

**وەر کەوتەی:** بەر کەوتن.خۆر کەوتن.

**ۆەر کێشای:** بەرکێشان. بەر ئاچۆخ کردن.

**ۆەر کێشتەی:** بەرکێشان. بەر ئاچۆخ کردن.

**ۆەرگ:** گورگ.

**ۆرگانە:** گورگانە. گورگ ئاسا.

**ۆەرگانە شەۆێ:** گورگە شەوێ. کورتەڵە باسێکی خورافی یە شەوان دایك منداڵی پێ دەخەوێنێت.

**ۆەرگا وارذە ، ۆەرگا وارذێ:** گورگان خواردوو.

**ۆەرگ بەرذە ، ۆەرگ بەرذێ:** گوگ بردوو.

**وۆرگ بەرژەی:** گورگ بردن.

**وۆر گرتەی:** بەر گرتن. بەرگری کردن.

**وۆر گرتەینە:** لەبەر گرتنا. لەبەرگری کردنا.

**وەرگرتەی:** وەرگرتن.

**وەرگرتەینە:** لە وەرگرتندا.

**وەرگرتەیۆ:** هەلگرتنەوە.

**وۆرگرژە:** پێش؛ بە واتای ((**بزەکا دە وۆرگرژە پەی دلێ گەلەی**)).

**وۆرگ گەلە:** گورگ گەل.

**وۆرگ نەبەر ، وۆرگ نەبەرە:** گورگ نەبەر.

**وۆرگە:** بەرگە.

**وۆرگە پشت ، وۆرگە پشتە:** گورگە پشت.

**وۆرگە دڕ ، وۆرگە دڕە:** بەرگە دڕ. مەبەست لە کەسێکە کە پۆشاک و پاپۆش زوو ئەدڕێنێ.

**وۆرگە دڕیی:** زوو دڕاندنی پاپۆش و پۆشاك.

**وۆرگە شەوێ:** گورگانە شەوێ.

**وۆرگە گرتەی:** بەرگە گرتن. تەحەمول کردن.

**وۆرگە گیر ، وۆرگە گیرە:** بەرگە گر.

**وۆرگە لۆقێ:** گورگە لۆقێ.

**وۆرگە لوور:** گورگە لوور.

**وەرگی:** گورگی. ڕەنگی مێش. ڕەنگی شێنکی.

**وۆرگیر ، وۆرگیرە:** بەرگر. بەرگریکەر.

**وۆرگیری:** بەرگیری. بەر لێ گرتن. ڕێ لێ گرتن.

**وۆر گیریا ، وۆر گیرییێ:** بەر گیراو. بەرگری کراو.

**وۆر گیریای:** بەر گیران. ڕێ لێ گیران.

**وەر گێریای:** خۆر گیران.

**وۆرگیری کەرژەی:** بەرگری کردن. ڕێ لێ گرتن.

**وەرلار ئەوە بی یەی:** خۆر لار بوونەوە. دەمەو ئێوارە.

**وەرلار بی یەیۆ:** خۆر لار بوونەوە. دەمەو ئێوارە.

**وەرلارۆ بی یەی:** خۆر لارەو بوون. کاتی ئێوارە.

**وۆرلە:** بەرخۆلە.

**وەرم:** خەو. خەون

**وەرم ئالۆسنین ، وەرم ئالۆسنینە:** خەوالوو؛ کەسێك کە هێشتا هەر خەو بەری نەدابێ.

**وەرم ئالۆسنینی:** خەوالوویی. خەوالوویێتی.

**وەرم ئامای:** خەو هاتن.

**وەرمالۆسن ، وەرمالۆسنە:** خەوالوو.

**وەرمالۆسنی:** خەوالوویی.

**وەرم ئەرە گرتەی:** خەو بردنەوە. خەو گرتن.

**وەرم ئەوۆ گێلنای:** خەو گێڕانەوە.

**وەرم بەرژەی لارە:** خەو بە لادا بردن. مەبەست لە کەسێکە خەو زۆری بۆ بێنێ و لاری بکاتەوە.

**وەرم پۆرە کۆتەی:** خەو پیا کەوتن.

**وەرم پۆرە کۆتەیۆ:** خەو پیا کەوتنەوە.

**وەرم پۆرە کەوتەی:** خەو پیا کەوتن.

**وەرم پۆرە کەوتەیۆ:** خەو پیا کەوتنەوە.

**وەرم پۆرە ۆزتەی:** خەو پیا خستن.

**وەرم پۆرە وستەی:** خەو پیا خستن.

**وەرم تابێڵ کەرژەی:** خەو لێکدانەوە.

**وەرم تێك دای:** خەو تێکدان. خەو شێواندن.

**وەرم تێك شی یەی:** خەو تێك چوون. خەو زڕان.

**وەرم دی یەی:** خەو بینین.

**وەرم رەمای:** خەو زڕان. خەو ڕەوین.

**وەرم ڕەمن ، وەرم ڕەمنە:** خەو ڕەوێن.

**وەم ڕەمنای:** خەو ڕەواندن. خەو زڕاندن.

**وەم زڕن ، وەم زڕنە:** خەو زڕێن.

**وەرم زڕنای:** خەو زڕاندن.

**وەرم زڕیا ، وەرم زڕییێ:** خەو زڕاو.

**وەرم زڕیای:** خەو زڕان.

**وەرم سووك ، وەرم سووکە:** خەو سووك.

**وەرم سووکی:** خەو سووکی.

**وەرم سەر شی یەی:** خەو بەسەر چوون.

**وەرم شیرین ، وەرم شیرینە:** خەو شیرین.

**وەرم شیرینی:** خەو شیرینی.

**وەرم شێۆن ، وەرم شێۆنە:** خەو شێوێن.

**وەرم شێۆنای:** خەو شێواندن.

**وەرم شێۆیا ، وەرم شێۆییێ:** خەو شێواو.

**وەرم شێۆیای:** خەو شێوان.

**وەرم قورس ، وەرم قورسە:** خەو قورس.

**وەرم قورسی:** خەو قورسی.

**وەرم کۆتەی پۆرە:** خەو پیا کەوتن.

**وەرم کۆتەیۆ پۆرە:** خەو پیا کەوتنەوە.

**وەرم کەرژەی:** خەو کردن. خەو ئاسایی.

**وەرم کەوتەی پۆرە:** خەو پیا کەوتن.

**وەرم کەوتەیۆ پۆرە:** خەو پیا کەوتنەوە.

**وەرم گرتەیراوە:** خەو داگرتنەوە. خەو بردنەوە.

**وەرم گرتەیرە:** خەو داگرتن. خەو بردنەوە.

**وەرم گرتەیەرە:** خەو داگرتن. خەو بردنەوە.

**وەرم گێڵنایۆ:** خەو گێڕانەوە.

**وەرم نامای:** خەو نەهاتن.

**وەرم نەبی یەی:** خەو نەبووت. بێ خەوی.

**وەرمۆ گێڵنای:** خەو گێڕانەوە.

**وەرم وەش ، وەرم وەشە:** خەو خۆش.

**وەرم وەشی:** خەو خۆشی.

**وەرم ۆینای:** خەو بینین.

**ۆەر مەڕ:** بەر ئەشکەوت.

**وەرمەنە:** لە خەودا. لە بەرما.

**وەرمین ، وەرمینە:** خەواڵوو.

**وەرنا:** ئەگینا.

**وەرنشین:** خۆرئاوا.

**وەرنما ، وەرنمێ:** پێش نوێژ.

**وەرنمایی:** بەر نوێژی.

**وەرنمایی کەرڎەی:** بە نوێژی کردن.

**وەرنە:** ئەگینا.

**وەر نەبەرڎەی:** خۆر نەبردن.

**وەر نەبی یەی:** بەر نەبوون.

**وەر نەدای:** بەر نەدان.

**وەر نەڎاینە:** تێ بەر نەدان.

**وەر نەڎایۆ:** بەر نەدانەوە.

**ەر نـــەوەزان:** شـــوێنێ کـــە خـــۆری تـــێ نەکەوێت.

**وەر نیشتەی:** خۆر ئاوابوون. نیشتنەبەر.

**ەرو:** لەبەر. لەبەر خاتری.

**وەرۆ:** پێشەوە. لە پێشەوە. لە بەرەوە

**وەروا:** بەربا.

**وەروانکە:** بەروانکە.

**وەرواوە:** بەفراو.

**وەرۆچـن:** لەبـەرەوە چـنینی دانەوێڵـە بـە وردیـی و جیـا کردنـەوەی شـتە نامۆکان لێی.

**وەرۆچن کریای:** چنینی دانەوێڵە بە وردیی و جیا کردنەوەی شتە نامۆکان لێی.

**وەرۆچـن کـەرڎەی:** بـەجێهێنانی کـاری ((**وەرۆچن**)).

**وەرودما:** بەرودوا.

**وەر وزتەی:** خستنە بەردەم.

**وەر وزتەینە دڵ:** شادی خستنە دڵەوە.

**وەر وزتـەیۆ:** خـۆر کەوتنـەوە لـەدوای گـەرم بوون و شاردرانەوەی.

**وەر وستەی:** خستنە بەردەم.

**وەر وستەینە دڵ:** شادی خستنە دڵەوە.

**وەر وستەیۆ:** خۆر دەرکەوتنەوە.

**وەرۆکە:** بەرۆك.

**وەرۆکەر:** بەفرگر. سەلاجە.

**وەرۆەگـا:** بەفرگـە. جێـی بـەفری مـاڵراوی سەربان.

**وەرۆۆ:** بە بەفرەوە.

**وەرۆ وزتەی:** خۆر دەرکەوتنەوە.

**وەرۆ وستەی:** خۆر دەرکەوتنەوە.

**وەرۆە:** بەفر.

**وەرۆە بـــوولکێ:** بـــەفرێکی دەنـــك ووردی سووکەڵەی مەیلەو وشکە.

**وەروەر:** وەروەر. دەمانچەی شاکۆز.

**وەرۆەرۆ:** بەفرماڵ.

**وەر وزتەینە دڵ:** شادی خستنە دڵەوە.

**وەر وەزەن:** بەر تاڤگە. بەردەم تاڤگە

**وەر وەزەنڎ:** بەر تاڤگە. بەردەم تاڤگە.

**وەر وستەینە دڵ:** شادی خستنە دڵەوە.

**وەر وســـتەینە دەروون:** شـــادی کەوتنـــە دەروونەوە.

**ەرۆە سەر:** خلیسکێنی سەربەفر.

**وەرۆە سـەر کـەرڎەی:** خـۆ خـشاندن بەسـەر بەفردا.

**ۆەرۆەگا:** بەفرگە. ئەو جێگایەی کە بەفری ماڵراوی سەربانی تێ ئەکەوێت.

**ۆەرۆەلا ، ۆەرۆەلێ:** بەربلاو.

**ۆەرەۆەماڵ:** بەفرماڵ.

**ۆەرۆێــچن:** بەربێــژنگ؛ بەشــێکە لــەو دانەوێڵەیە کە لە بێژنگ ئەدرێ. یان بێژنگ دای دەدات.

**ۆەرۆێرك ، ۆەرۆێرکە:** وەروێرکە. وەرگێرکە.

**ۆەرۆین ، ۆەرۆینە:** بەفرین. بەفراوی.

**ۆەرهاڵ:** بەشی پێشەوەی دیوار بۆ نـەکراوی هەیوان لە نهۆمی دووم یان سێهەمی خانوودا.

**ۆەرهەلا:** شوێنی بێ دیوار کە هەوا بیگرێت.

**ۆەرهەڵیز:** مەشکۆڵە. مەشکەی بچکۆلە.

**وەرهەم:** وەرهەم. مەراق.

**وەرهــەم کــەرڎەی:** مــەراق کــردن. وەرهــەم کردن.

**ۆەر هەیوان:** بەر هەیوان.

**ۆەرهیت:** نەوەنی پێگەییو بۆ جووت کردن.

**وەرەبــڕێ:** دیــاری کردنــی بەشــی ئــیش و پێشبڕکێ کردن تێیدا.

**وەرە:** بەرخ. باوەش. بڕی کار. بەردەم.

**ۆەرە بەرە:** بەر دەرگا.

**ۆەرە بەرێ:** پێشبڕکێ لە ئیش و کاردا.

**ۆەرە بەرێ کەرڎەی:** پێشبڕکێ کردن لـە ئـیش و کاردا.

**وەرتاۆ:** خۆرەتاو. هەتاو.

**وەرەتــاۆ پــڕای:** خۆرەتــاو پــەڕین. هــەتاو نەمان.

**وەرەتــاۆ کۆتــەی:** خۆرەتــاو کــەوتن. کــاتی گزنگ.

**وەرەتــاۆ کەوتــەی:** خۆرەتــاو کــەوتن. کــاتی گزنگ.

**ۆەرەچەم:** بەرچاو.

**ۆەرەچەم ئامای:** پێ ناخۆش بوون لـە بـواری خەرج و مەسرەف و خولکا.

**ۆەرەچــەم ئــاورا ، ۆەرەچــەم ئــاورێ:** ڕژدی پیسکە.

**ۆەرەچەم ئاورای:** بەرچاو تەنگی. ڕژدی.

**ۆەرەچەماۆە:** بە بەرچاوەوە.

**ۆەرەچەم تاریك ، ۆەرەچەم تاریکە:** بەرچاو تاریك.

**ۆەرەچــەم تاریــك بــی یــەی:** بەرچــاو تاریــك بوون.

**ۆەرەچــــەم تاریکنــــایرە:** بەرچــاو تاریــك داهێنان.

**ۆەرەچــەم تاریکنایــەرە:** بەرچــاو تاریــك داهێنان.

**ۆەرەچەم تاریکیایرە:** بەرچاو تاریك داهاتن.

**ۆەرەچــەم تاریکیایــەرە:** بەرچــاو تاریــك داهاتن.

**ۆەرەچەم تاریکی:** بەرچاو تاریکی.

**ۆەرەچــەم تــەنگ ، ۆەرەچــەم تەنگــە:** بەچــاو تەنگ. پیسکە.

**ڤەرەچەم تەنگی:** بەچاو تەنگی. ڕژدی.

**ڤەرەچەم تێر ، ڤەرەچەم تێرە:** بەرچاو تێر.

**ڤەرەچەم تێریی:** بەرچاو تێریی.

**ڤەرەچەم سیاڤ بی یەی:** بەرچاو ڕەش بوون.

**ڤەرەچەم سێر ، ڤەرەچەم سێرە:** بەرچاو تێر.

**وەرەچەم سێریی:** بەرچاو تێریی.

**ڤەرەچەم فەرێح ، ڤەرەچەم فەرێحە:** شوێنی بەرچاو گوشاد. شوێنی فراوان کە دڵی تیا بکرێتەوە.

**ڤەرەچەم فەرێحی:** بەرچاو گوشادیی. فراوانی جێگا و کرانەوەی دڵ تیایدا.

**ڤەرەچەم کۆتەی:** لە بەرچاو کەوتن. بێزران.

**ڤەرەچەم کەوتەی:** لە بەرچاو کەوتن. بێزران.

**ڤەرەچەم نامای:** پێ گران نەبوونی خەرج و مەسرەف و ماڵ و سامان.

**ڤەرەچەم ڤزتەی:** لە بەرچاو خستن. بێزراندن.

**ڤەرەچەم وستەی:** لە بەرچاو خستن. بێزراندن.

**ڤەرە ڕا:** بەر ڕێگە. ڕێگەیەك کە ئامۆشۆی زۆری پیادا ئەکرێت. بەرڕێ.

**ڤەرە ڕانە:** لەبەر ڕێدا.

**ڤەرە ڕوو:** لەڕوودا. پێچەوانەی پاشە ملە.

**ڤەرە ڕوونە:** لەڕوودا. ڕووبەڕوو.

**ڤەرەرە:** بەپێشدا. بەرِوودا.

**وەرە زەرڎە:** زەردە پەڕ.

**ڤەرە سوخمە:** بەری سوخمە.

**وەرەسە:** کەسانی مردوو کە میراتی ئەمیان بۆ دێتەوە.

**ڤەرە سەڵتە:** بەری سەڵتە.

**ڤەرە شێڵە:** خۆری تەنك و شاش و شەوێڵ کە لە میانی بەرگرەوە دێتە ژوورەوە.

**وەرەق:** وەرەق.

**وەرەقاقە:** خۆری بە تینی بێ با و بێ شەماڵ.

**وەرەقە:** وەرەقە. پەڕە کاغەز.

**وەرەقە قومار:** کاغەز قومار.

**ڤەرە کورپە:** بەرخی ساوا.

**ڤەرە گەلە:** بەرغەل.

**وەرەم:** وەرەم. دەردە باریکە.

**وەرەمەدار ، وەرەمەدارە:** وەرم دار. دووچار بووی دەردی باریکە.

**وەرەمەداری:** وەرەمەدرای. دووچار بوونی دەردە باریکە.

**ڤەرە مێلێ:** بەرخی مێ. بەرخی مێینە.

**ورەندڵ:** ناوی جۆرە تفەنگێکە.

**وەرەنگاز ، وەرەنگازە:** خۆرەنگاز.

**وەرەنگاز بی یەی:** خۆرەنگاز بوون.

**وەرەنگاز کەرڎەی:** خۆرەنگاز کردن.

**وەرەنگازی:** خۆرەنگازی.

**ڤەرەنە:** لە ئامێزدا. لە بەردەمەوە. لە بەرەوە.

**وەرە نێرە:** بەرخی نێر.

**وەرەوانکە:** بەروانکە.

**وەرەوچەرە:** برینێکی ناسۆرە لە شێرپەنجە و موو ئەچێت، لە ئەندامی مرۆڤ دەردێت.

**وەرە وەرە:** بەرە بەرە. وردە وردە.

**وەرێسانە:** مووی ڕێسراوی تایبەتی گوریس

**وەرێس دەسە کەرژەی:** هەلۆیژنین.

**وەرێسە:** گوریس

**وەڕ ، وەڕە:** پاشگرێکە ((وەڕ)) ئەچێتە سەر هەندێ ناو و ئەیکات بە ئاوەڵناوی داڕێژراو.

**وەرس ، وەرسە:** وەرس. بێزار.

**وەرس بی یەی:** وەرس بوون.

**وەرس کەرژەی:** وەرس کردن.

**وەرسی:** وەرسی. بێزاری.

**وەز:** بەز.

**وەزارەت:** وەزارەت.

**وەزانی:** یاری کردن بە گوێز.

**وەزاوە:** بەزاو. چەوریی داچۆڕاو لە بەز.

**وەز تەکن ، وەز تەکنە:** گوێز تەکێن. شەنیار.

**وەز تەکنای:** گوێز تەکاندن.

**وەز تەکیای:** گوێز تەکان. کاتی گوێز تەکاندن.

**وەزتەی:** هەڵزنین. هەڵگەڕان بەقەد شتا.

**وەزتەیراوە:** دابەزینەوە

**وەزتەیرە:** دابەزین.

**وەزتەیناوە:** دابەزینە ناو. تێ نیشتنەوە.

**وەزتەینە:** دابەزینەناو. تێ نیشتن

**وەزتەیەرە واری:** دابەزینە خوارەوە.

**وەزتەیۆ:** هەڵزنینەوە

**وەزتەیەرە:** دابەزین.

**وەزتەیەنە:** دابەزینەناو. تێ نیشتن.

**وەزدان:** بەزدان.

**وەزسان ، وەزسانە:** گوێزسێن.

**وەز شارۆکەر ، وەز شارۆکەرە:** گوێز شارۆ کەر.

**وەز شارۆ کەرژەی:** گوێز شارۆ کردن.

**وەزشان ، وەزشانە:** گوێز تەکێن. شەنیار.

**وەزشانای:** گوێز تەکاندن. گوێز وەراندن.

**وەزشای:** گوێز تەکاندن. گوێز وەراندن.

**وەزعە:** وەزع. بارودۆخ.

**وەزعیەت:** وەزعیەت. بارودۆخ.

**وەزڵێ:** دار گوێزی بچکۆلانە.

**وەزنای:** هەڵزناندن. هەڵگەڕاندن بەقەد شتی بەرزد

**وەزنایراوە:** دابەزاندنەوە

**وەزنایرە:** دابەزاندن. هێنانە خوارەو

**وەزناینە:** تێ نیشاندن. دابەزاندنە نا

**وەزنایۆ:** هەڵزاندنی دووبار

**وەزنایەرە:** دابەزاندن. هێنانە خوارەو

**وەزنایەنە:** تێ نیشاندن. دابەزاندنە نا

**وەزنـدار ، وەزنـدارە:** وەزنـدار. سـەنگین. بـە کێش.

**وەزنداری:** وەزنداری. سەنگینی. کێشداری.

**وەزن کریا ، وەزن کریێ:** وەزن کراو. کێشراو.

**وەزن کریای:** وەزن کران. کێشران.

**وەزن کەر ، وەزن کەرە:** وەزن کەر.

**وەزن کەرڎەی:** وەزن کردن. کێشانە کردن.

**وەزنە:** وەزن. کێش.

**وەزنەنە:** لە وەزندا. لە کێشدا.

**وەز ۆرەش ، وەز ۆرەشە:** گوێز فرۆش.

**وەز ۆرەشی:** گوێز فرۆشی.

**وەزوەر ، وەزوەرە:** گوێزخۆر. بەزخۆر.

**ۆەزە:** وەزە. بەبابوونی ڕێوی

**وەزەبان:** گوێزەبانە.

**وەزەبان کەرڎەی:** گوێزەبانە کردن.

**وەزە پـــاقلیرە:** گـوێزی لـە تـوێکڵی سـەوز دەرچووگ.

**ۆەزەتـاۆ:** بەزەتاو.

**ۆەزەتـاۆ کەرڎەی:** بەزەتاو کردن.

**وەزە جمعـــانیْ:** گوێزێکـــە بەرهەمەکـــەی تـەرخان کرابـێ بـۆ بەخـشینەوە لـە ڕۆژی هەینی دا.

**وەزە کـۆرە:** گوێزی کوێر کە کاکڵەکـەی زۆر بە زەحمەت دەرئەهێنرێت.

**وەزە کەمکۆڵـە:** گـوێزێ کـە لـە نـاو توێکڵە سەوزەکەیدا بێ.

**وەزە گەلاۆێژیە:** گوێزی گەلاوێژی؛ گوێزێکی وردی بێ کاکڵەیە و درەنگێ دارەکەی گرتوویەتی.

**وەزە مەژگیْ:** گوێزێکە کاکڵەکەی باش بێت و بـە ئاسـانی بـشکێت و کاکڵەکـەی دەربێت.

**ۆەزەنـڎ ۆنـە کـەرڎەی:** دەسـت لـێ وەشـاندن. زیان پێ گیاندن

**ۆەزەنڎ وەنـە کـەرڎەی:** دەسـت لـێ وەشـاندن. زیان پێ گیاندن

**ۆەزەنڎی:** تاقگە. زیان. ئازار

**ۆەزەننی:** تاقگە. زیان. ئازار

**وەزەنی:** وەزەنی؛ جۆرە مەلهەمێکە

**وەزە ۆان ، وەزە ۆانە:** کەسێك کە باش بە دار گوێزدا هەڵ بگەڕێ.

**وەزە ۆانی:** باش هەڵگەڕان بە دار گوێزدا.

**وەزی:** گوێز

**وەزیر ، وەزیرە:** وەزیر.

**وەزیری:** وەزیری.

**وەزیفە:** وەزیفە. ئەرکی سەر شان.

**وەزیفە دار ، وەزیفە دارە:** وەزیفە دار.

**وەزیفە داری:** وەزیفە داری.

**ۆەزیْ:** نەخۆشی یەکە دەداتە دەمی منداڵ.

**وەزین ، وەزینە:** هەرچی کە لـە گوێز یـان دار گوێز دروست بکرێ

**ۆەژتەی:** داکەندن. گروون. دەرهێنان

**ۆەژیا ، ۆەژییْ:** گرواو. داکەنراو. دەرهێنراو

**وەژیای:** داکەنران. دەرهێنران. گورووا

**وەس:** بەس.

**وەساسەت:** بۆنە. موناسەبەت. هۆ.

**وەستەی:** هەڵزنین. هەڵگەڕان بەقەد شت

**وەستەیراوە:** دابەزینەوە

**وەستەیرە:** دابەزین

**وەستەیرە وار:** دابەزینە خوار. هاتنە خوا

**وەستەیرە واری:** دابەزینە خوارێ. هاتنە خوارێ

**وەستەیناوە:** تێ نیشتنەوە. چوونەوە نا

**وەستەینە:** تێ نیشتن. دابەزینە ناو

**وەستەیۆ:** هەڵزنینەوە

**وەستەیەرە:** دابەزین. هاتنە خوار

**وەستەیەنە:** تێ نیشتن. دابەزینە ناو

**وەسف:** وەسف. تاریف.

**وەسف دای:** تاریف کردن. وەسف کردن.

**وەسف کریا ، وەسف کریێ:** وەسف کراو.

**وەسف کریای:** وەسف کران. تاریف کران.

**وەسف کەرذەی:** وەسف کردن.

**وەسواس ، وەسواسە:** وەسواس.

**وەسواسی:** وەسواسی.

**وەسوەسە:** وەسوەسە. ڕاڕایێتی. دوو دڵی.

**وەسەت ، وەسەتە:** ناوەنجی. تفەنگی برنەوەی نە زۆر درێژ و نە زۆر کورت.

**وەسەذ مەلە:** ناوی گۆرانی یەکی هۆرامی یە.

**وەسیەت:** وەسیەت.

**وەسیەتکەر ، وەسیەتکەرە:** وەسیەتکەر.

**وەسیەت کەرذەی:** وەسیەت کردن.

**وەسیەت نامە:** وەسیەت نامە.

**وەسیەتەنە:** لە وەسیەتدا.

**وەش ، وەشە:** خۆش. جوان. زوو. چاك

**وەش ئامای:** خۆش هاتن.

**وەشانە:** خۆشانە؛ لەدوای ((دەس)) دێت.

**وەشایی:** کاتی خۆشی. جێگای خۆشی.

**وەش ئەوە بی یەی:** خۆش بوونەوە.

**وەش ئەوە کریای:** خۆش کرانەوە.

**وەش ئەوە کەرذەی:** خۆش کردنەوە.

**وەش ئەوە نەبی یەی:** خۆش نەبوونەوە.

**وەش ئەوە نەکریای:** خۆش نەکرانەوە.

**وەش ئەوە نەکەرذەی:** خۆش نەکردنەوە.

**وەش باوەڕ ، وەش باوەڕە:** خۆش باوەڕ.

**وەش باوەڕی:** خۆش باوەڕی.

**وەش بۆ ، وەش بۆە:** خۆش بۆن.

**وەش بۆیی:** خۆش بۆنی.

**وەش بەخت ، وەش بەختە:** خۆش بەخت.

**وەش بەختی:** خۆش بەختی.

**وەش بی یە ، وەش بیێ:** خۆش بووگ.

**وەش بی یەی:** خۆش بوون.

**وەش بی یەینە:** لە خۆش بووندا.

**وەش بی یەیۆ:** خۆش بوونەوە.

**وەش بی یەیەنە:** لە خۆش بووندا.

**وەش پۆش ، وەش پۆشە:** خۆش پۆش.

**وەش پۆشای:** خۆش پۆشین.

**وەش پۆشتەی:** خۆش پۆشین.

**وەش پۆشی:** خۆش پۆشی.

**وەش پنە کۆتەی:** خۆش پێ کەوتن. لێهاتن.

**وەش پنە کەوتەی:** خۆش پێ کەوتن.

**وەش پەنە کۆتەی:** خۆش پێ کەوتن.

**وەش پەنە کەوتەی:** خۆش پێ کەوتن.

**ۆەشت:** باران.

**وەش تاڵە ، وەش تاڵێ:** خۆش بەخت.

**وەش تاڵەیی:** خۆش بەختی.

**ۆشتاوە:** باراناو.

**ۆەشت ۆارای:** باران بارین.

**ۆەشت و ۆاران:** وەشت و باران.

**وەشتەر ، وەشتەرە:** خۆشتر.

**وەشتەرین ، وەشتەرینە:** خۆشترین.

**وەش چنی ئامای:** خۆش لێ هاتن.

**وەش چنی نامای:** خۆش لێ نە هاتن.

**وەش چەنی ئامای:** خۆش لێ هاتن.

**وەش چەنی نامای:** خۆش لێ نە هاتن.

**وەش حاڵ ، وەش حاڵە:** خۆش حاڵ.

**وەش حاڵ بی یەی:** خۆش حاڵ بوون.

**وەش حاڵ کەرذەی:** خۆش حاڵ کردن.

**وەش حاڵی:** خۆش حاڵی.

**وەش خۆ ، وەش خۆە:** خۆش خوو.

**وەش خۆیی:** خۆش خویی.

**وەش خەنـذەران ، وەش خەنذەرانـە:** خـۆش خەندەران.

**وەش خەنذەرانی:** خۆش خەندەرانی.

**وەش خەننـەران ، وەش خەننەرانـە:** خـۆش خەندەران.

**وەش خەننەرانی:** خۆش خەندەرانی.

**وەشدڕ ، وەشدڕە:** خۆش پۆش.

**وەش دڕیەی:** خۆش پۆشین.

**وە دڕیی:** خۆش پۆشی.

**وەش دۆخـت ، وەش دۆختـە:** خـۆش شـێوە. خۆش شکڵ. خۆش دیمەن.

**وەش دۆختی:** خۆش شێوەیی. خۆش شکڵی.

**وەش دەس ، وەش دەسە:** خۆش دەست.

**وەش دەسی:** خۆش دەستی.

**وەش ڕۆت ، وەش ڕۆتە:** خۆش ڕەوت.

**وەش ڕۆتی:** خۆش ڕەوتی.

**وەش ڕەفتار ، وەش ڕەفتارە:** خۆش ڕەفتار.

**وەش ڕەفتاری:** خۆش ڕەفتاری.

**وەش زۆان ، وەش زۆانە:** خۆش زمان.

**وەش زۆانی:** خۆش زمانی. زمان شیرینی.

**وەش زۆمەیی:** بە ئاسانی زانی مێنگە.

**وەش زومـێ:** ئافرەتـێ بـە ئاسـانی منـداڵی ببێت.

**وەش زەوق ، وەش زەوقە:** بە کەیف.

**وەش زەوقی:** بە کەیفی. خۆش کەیفی.

**وەش سـەلێقە ، وەش سـەلێقێ:** خـۆش سەلیقە.

**وەش سەلێقەیی:** خۆش سەلیقەیی.

**وەش سیای:** خۆش ویستن.

**وەش کریا ، وەش کریێ**: خۆش کراو. چاك کراو.

**وەش کریای**: خۆش کران. چاك کران.

**وەش کریایۆ**: خۆش کرانەوە. چاك کرانەوە.

**وەشکەر ، وەشکەرە**: خۆش کەر. چاك کەر.

**وەش کەرڎەی**: خۆش کردن. چاك کردن. پەلە کردن. دروست کردن.

**وەش کەرڎەیۆ**: خۆش کردنەوە. چاك کردنەوە.

**وەش کەیف ، وەش کەیفە** : خۆش کەیف.

**وەش کەیفی** : خۆش کەیفی.

**وەش گفت ، وەش گفتە** : خۆش گفت.

**وەش گفتار ، وەش گفتارە**: خۆش گفتار.

**وەش گفتاری**: خۆش گفتاری.

**وەش گفتی** : خۆش گفتی.

**وەش گلەیی ، وەش گلەییە** : خۆش گلەیی.

**وەش گلەییەتی**: خۆش گلەییێتی.

**وەش گوفت ، وەش گوفتە** : خۆش گوفت.

**وەش گوفتار ، وەش گوفتارە**: خۆش گوفتار.

**وەش گوفتاری**: خۆش گوفتاری.

**وەش گوفتی** : خۆش گفتی.

**وەش گوزەران ، وەش گوزەرانە** : خۆش گەزەران.

**وەش گوزەرانی**: خۆش گەزەرانی.

**وەش گەرەك بی یەی**: خۆش ویستن.

**وەش لۆای**: خۆش چوون. بەخێر چوون.

**وەش لۆخت ، وەش لۆختە** : خۆش شێوە. خۆش شکڵ. خۆش ڕوخسار.

**وەش لۆختی** : خۆش شێوەیی. خۆش شکڵی.

**وەش لەوەڕ ، وەش لەوەڕە**: خۆش لەوەڕ.

**وەش لەوەڕیی**: خۆش لەوەڕیی.

**وەش لیاقەت ، وەش لیاقەتە** : خۆش لیاقەت. جوانی پێکەوتوو.

**وەش لیاقەتی**: خۆش لیاقەتی.

**وەشلانە ، وەشلانێ**: جوانکیلە.

**وەشلانەیی** : جوانکیلانەیی.

**وەشلە ، وەشلێ**: جوانکیلە.

**وەشلەی**: خۆزگە. کاشکی.

**وەشلەیی** : جوانکیلەیی.

**وەش مامەڵە ، وەش مامەڵێ**: خۆش مامەڵە.

**وەش مزانی ، وەش مزانیە** : خۆش موژدە یانی یاخوا خۆش موژدە بی و موژدەی خۆشت پێ بگات.

**وەش مزانی بی یەی**: خۆش موژدە بوون. دوعایەکی خێرە؛ **بە واتای**: یاخوا موژدەی خۆشت بدەنێ.

**وەش مەزە ، وەش مەزێ**: خۆش مەزە. خۆش تام.

**وەش مەزەیی**: خۆش مەزەیی. تام خۆشی.

**وەش نامای**: خۆش نەهاتن.

**وەش نا...** : خۆشنە...؛ بۆ نەفی یە.

**وەش نەبی یەی**: خۆش نەبوون.

**وەش نەبی یەیۆ**: خۆش نەبوونەوە.

**وەش نە...:** خۆشنە...؛ بۆ نەفی یە.

**وەشۋاتەی:** خۆشووتن.

**وەش ۋاچ ، وەش ۋاچە:** خۆش بێژ.

**وەشۆ بی یەی:** خۆش بوونەوە. چاك بوونەوە.

**وەشۆ کریای:** خۆش کرانەوە. چاك کرانەوە

**وەشۆ کەرڎەی:** خۆشە کردنەوە. چاك کردنەوە.

**وەش وەر ، وەش وەرە:** خۆش خۆر.

**وەش وەرم ، وەش وەرمە:** خۆش خەو.

**وەش وەرمی:** خۆش خەوی. خەو خۆشی.

**وەش وەری:** خۆش خۆری.

**وەش وەش:** خۆش خۆش. زوو زوو.

**وەش وەشێ:** خۆش خۆشێ.

**وەش وەشێۆ:** خۆش خۆشێ.

**وەش ۋیارای:** خۆش ڕابواردن.

**وەش ۋیارایرە:** خۆش بەسەر بردنی کات.

**وەش ۋیارایەرە:** خۆش بەسەر بردنی کات.

**وەش ۋیر ، وەش ۋیرە:** بیر خۆش؛ کەسێکە کە شتی ڕابردووی بە جوانی دێتەوە یاد.

**وەش ۋیری:** خۆش بیری. خۆش یادی.

**وەشە:** خۆشی؛ پێچەوانەی توند و تیژی.

**وەشەسیا ، وەشەسیێ:** خۆشەویست.

**وەشەسیای:** خۆشەویستی.

**وەشەۋیس ، وەشەۋیسە:** خۆشەویست.

**وەشەۋیسی:** خۆشەویستی.

**وەشی:** خۆشی. جوانی. چاکی.

**وەشی و تشی:** چۆنی و چاکی. خۆشی و ترشی.

**وەشی وەشی:** خۆشی خۆشی.

**وەشیێنە:** لە خۆشیدا.

**وەعد:** وەعد. وادە. بەڵێن.

**وەعد دای:** وەعد دان.

**وەعد دەر ، وەعد دەرە:** وەعد دەر.

**وەفا:** وەفا.

**وەف بی یەی:** وەفا بوون. وەفاداری.

**وەفات:** وەفات. مردن. مەرگ.

**وەفات کەرڎەی:** وەفات کردن.

**وەفاڎار ، وەفاڎارە:** وەفادار.

**وەفاڎاری:** وەفاداری.

**وەفا کاری:** وەفا کاری. وەفاداری.

**وەفد:** وەفد. شاند.

**وەقرە:** وەقرە. ئۆقرە. ئارام.

**وەقرە بڕیا ، وەقرە بڕیێ:** ئۆقرە لێ بڕاو.

**وەقرە بڕیای:** ئۆقرە لێ بڕان.

**وەقرە بڕیەی:** وەقرە لێ بڕین. ئۆقرە لێ بڕین.

**وەقرە گرتەی:** ددان بە خۆدا گرتن.

**وەقرە ۋنە بڕیای:** ئۆقرە لێ بڕان.

**وەقرە ۋنە بڕیەی:** ئۆقرە لێ بڕین.

**وەقف:** وەقف. مەوقووفە.

**وەقف کەرڎەی:** کردنی شت بە مەوقووفە.

**وەکازێ:** وەکازە. عاسا. دار عاسا.

**وەکالەت:** وەکالەت.

**وەکیل ، وەکیلە:** وەکیل. بریکار.

**وەکیل گرتەی:** کردنی کەسێك بە وەکیل.

**وەکیلەڵلا:** وەکیلەڵلا. خودا وەکیل.

**وەکێڵ ، وەکێڵە:** وەکیل.

**وەکیلی:** وەکیلی.

**وەکێڵی:** وەکێڵی. وەکیلی.

**وەلەك:** وەلەك.

**وەلەو:** هەرچەند. هەرچەندە.

**وەلی ، وەلیە:** وەلی. دۆستی خوا.

**وەلیەتی:** وەلیەتی. دۆستایەتی خوا.

**وەڵا ، وەڵێ:** بڵاو.

**وەڵا ئەوە بی یەی:** بڵاو بوونەوە.

**وەڵا ئەوە کریای:** بڵاو کرانەوە.

**وەڵا ئەوە کەرڎەی:** بڵاو کردنەوە.

**وەڵا بی یەی:** بڵاو بوون.

**وەڵا بی یەیۆ:** بڵاو بوونەوە.

**وەڵات:** وڵات. نیشتمان.

**وەڵات پارێز ، وەڵات پارێزە:** وڵات پارێز.

**وەڵات پارێزنای:** وڵات پاراستن.

**وەڵات پارێزی:** وڵات پارێزی.

**وەڵات پەروەر ، وەڵات پەروەرە:** وڵات پەروەر.

**وەڵات پەروەری:** وڵات پەروەری.

**وەڵاتەرە:** بە وڵاتدا بەرەوە خوار.

**وەڵاتەنە:** لە وەڵاتدا.

**وەڵاتی ، وەڵاتیە:** خەڵکی ووڵات. وەتەنی.

**وەڵا کریایۆ:** بڵاو کرانەوە.

**وەڵا کەرڎەیۆ:** بڵاو کردنەوە.

**وەڵاوەدیم ، وەڵاوەدیمە:** واژۆ. هەڵاوە گێڕ.

**وەڵاوەدیمی:** واژۆیی. هەڵاوە گێڕی.

**وەڵاوەفار ، وەڵاوەفارە:** بەراوپشت.

**وەڵاوەفار کریا ، وەڵاوەفار کریێ:** شتی بەراوپشت کراو.

**وەڵاوەفار کریای:** بەراوپشت کران.

**وەڵاوەفار کەرڎەی:** بەراوپشت کردن.

**وەڵاوە:** بڵاوە.

**وەڵاوە پنە کەرڎەی:** بڵاوە پێ کردن.

**وەڵاوە پەنە کەرڎەی:** بڵاوە پێ کردن.

**وەڵاوە کەرڎەی:** بڵاوە کردن.

**وەڵایی:** بڵاوی.

**وەڵتەر:** پێشتر.

**وەڵتەرۆ:** لەپێشترەوە.

**وەڵتەرەنە:** لەپێشتردا.

**وەڵك:** گەڵا.

**وەڵگ:** گەڵا.

**وەڵڵا:** سوێند بە خوا. ((والله)).

**وەڵڵاهی:** سوێند بە خوا. ((والله)).

**وەڵەد:** کوڕ؛ لە ((ولد)) ی عەرەبییەوە هاتووە.

**وەڵەفە:** قوڵف؛ جۆرە گرێیەکە ئەدرێت لە گوریس و پەت و شتانی لەم بابەتە.

**وەڵێ:** پێش. ((قبل)). لە پێش.

**وەڵیاڎ:** نەوە و نەوە زا.

**وَەڵێفەت :** وەلیفەت. مفتە.

**وَەڵێن ، وَەڵێنە :** پێشین. ئەوەی پێش.

**وَەڵێنە :** لە پێشا. پێشتر. ڕابردوو.

**وَەڵێنیْ :** پێشینان.

**وَەڵێوَە :** لە پێشەوە. لە بەرەوە.

**وەن ، وەنــە :** پاشــگرێکە بەرامبــەر پاشــگری ((خـــوێن)). وەك: **قورئـــــان وەن :** قورئان خوێن.

**وەناق :** وەناق. ملەخڕە. خەناق.

**وەنام ، وەنامە :** بەدناو.

**وەنام بی یەی :** بەدناو بوون.

**وەنام کریای :** بەدناو کران.

**وەنام کەرڎەی :** بەدناو کردن.

**وەنامی :** بەدنامی.

**وە نجەنە :** بەنەخوێن.

**وەنڎە :** میان. ناوەند.

**وەنڎەنیــە :** پردیێکــە لــە لقــی مێــو دروســت ئــەکرێت بەســەر ڕووبــارەوە، یــان بەسەر دۆڵێکەوە.

**وَەنـگ :** چـان. مێرووڵـە کردنــی ئەنــدام لــە ئەنجامی سەرماوە.

**وەنگا :** قوتابخانە. خوێندنگا.

**وەننە :** میان. ناوەند.

**وەننەنیە :** (( **وەنڎەنیە** ))، پێشتر باس کرا.

**وَەنۆزدای :** وەنەوزدان. وەنەوز بردنەوە.

**وَەنۆز کەرڎەی :** وەنەوز کردن. خەو کردنێکی زۆر کورتی خێرا.

**وَەنۆزە کوتیْ :** وەنەوز بردنەوە.

**وَەنۆزی :** وەنەوز.

**وَەنۆشە :** وەنەوشە.

**وەنۆشەیی ، وەنۆشەیی یە :** وەنەوشەیی.

**وەنۆشــی ، وَەنۆشــیە :** ڕەنگــی وەنەوشــەیی. شتێك کە ڕەنگی وەنەوشەیی بێت.

**وَەنۆڵە :** بەنۆڵە.

**وَەنە :** پێشگرێکە بە واتای ((لێ)).

**وەنە ئارڎەی :** لێهێنان.

**وەنە ئامای :** لێهاتن.

**وەنە ئاوَرڎەی :** لێهێنان.

**وەنە ئەوَە بڕیای :** لێبڕانەوە.

**وەنە ئەوَە پەرسای :** لێ پرسینەوە.

**وەنە ئەوَە تەوَەسنای :** دڵ لێ ئێشاندن.

**وەنە ئەوَە تەوَەسیای :** دڵ لێ ئێشان.

**وەنە ئەوَە تێـڕ بـی یـەی :** خێسە لـێ کـردن.

**وەنە ئەوَە جمای :** پەلە تیا کردن.

**وەنە ئەوَە جمنای :** پەلە لێ کردن.

**وەنە ئەوَە چیای :** سارد بوونەوەی عەرەق بـە لەشەوە. لێ سارد کردن.

**وەنــە ئــەوَە چــێڕیای :** لــێ شــاتاندن. لــێ قیژاندن.

**وەنە ئـەوَە چـێقیای :** چیق و هووڕ بەسـەرا کردن.

**وەنە ئەوَە خڕ کەرڎەی :** لێ خڕ کردنەوە.

**وەنە ئەوَە خڕۆشنای :** لێ کۆکردنەوە.

**وەنە ئەوَە خڕۆشیای :** لێ کۆبوونەوە.

**وەنە ئەوۆ دای:** لێدانەوە.

**وەنە ئەوۆ دریای:** لێدرانەوە.

**وەنە ئەوۆ ژلێۆنای:** پەلە لێ کردن. پەلە تیا کردن.

**وەنە ئەوۆ شێڕیای:** لێ شیڕاندن. لێ شیڕانەوە.

**وەنە ئەوۆ کۆتەی:** عار نان. ئاتاجی لێ کەوتنەوە.

**وەنە ئەوۆ کەرژەی:** لێ کردنەوە.

**وەنە ئەوۆ کەوتەی:** عار نان. ئاتاجی لێ بوونەوە.

**وەنە ئەوۆ گرتەی:** لێ گرتنەوە.

**وەنە ئەوۆ گێریای:** لێ گیرانەوە.

**وەن ئەوۆ گێڵای:** لێ گەڕانەوە. لێ چەرخانەوە.

**وەنە ئەوۆ گێڵنای:** لێ گەڕاندنەوە.

**وەنە ئەوۆ لار بی یەی:** لێ لار بوونەوە.

**وەنە ئەوۆ لار کەرژەی:** لێ لار کردنەوە.

**وەنە ئەوۆ لاڵیای:** لێ پاڕانەوە.

**وەنە ئەوۆ مدرای:** لێ وەستاندنەوە.

**وەنە ئەوۆ نیای:** لێ نانەوە.

**وەنە ئەوۆ وانای:** لێ خوێندنەوە.

**ونە ئەوۆ وَزتەی:** لێ خستنەوە.

**ونە ئەوۆ وستەی:** لێ خستنەوە.

**وەنە ئەوە وەنەی:** لێ خوێندنەوە.

**وەنە بڕیای:** لێ بڕان.

**وەنە بێزنای:** لێ بێزاندن. لەبەرچاو خستن.

**وەنە بێزیای:** لێ بێزران. لێ بێزان.

**وەنە بینای:** لێ بەستن.

**وەنە پڕای:** لێ پەڕین.

**وەنە پرمنای:** لێ پرماندن.

**وەنە پڕنای:** لێ پەڕاندن.

**وەنە پژگنای:** لێ پژاندن.

**وەنە پژگیای:** لێ پژان.

**وەنە پەرسای:** لێ پرسین.

**وەنە پەرسایۆ:** لێ پرسینەوە.

**وەنە پیس کەرژەی:** لێ پیس کردن.

**وەنە پێقنای:** لێ پیقاندن. هۆڕین بۆ لێدان.

**وەنە پێۆیای:** لێ دیار بوون. لێ مەعلووم بوون.

**وەنە پێۆیایۆ:** لێ دیار بوون. لێ ئاشکرا بوون.

**وەنە تاریك بی یەی:** لێ تاریك بوون.

**وەنە تاریك کەرژەی:** لێ تاریك کردن.

**وەنە تاڵ بی یەی:** لێ تاڵ بوون.

**وەنە تاڵ کەرژەی:** لێ تاڵ کردن.

**وەنە تنۆ کەرژەی:** لێ توند کردن.

**وەنە تنۆ کەرژەیۆ:** لێ توند کردنەوە.

**وەنە تۆرنای:** لێ تۆراندن.

**وەنە تۆریای:** لێ تۆران.

**وەنە تونۆ کەرژەی:** لێ توند کردن.

**وەنە تونۆ کەرژەیۆ:** لێ توند کردنەوە.

**وەنە تە پای:** لێ تەپین. بەسەرا تەپین.

**وەنە تە پنای:** لێ تەپاندن. بەسەرا تەپاندن.

**وەنە تەڤناى:** لێ تەڤاندن.

**وەنە تەڤێ:** وەنە تەق؛ دار قەزوانێکە دەنکی قەزوانەکانی ورد و ناسکن.

**وەنە تەکناى:** لێ تەکاندن.

**وەنە تەکیاى:** لێ تەکان.

**وەنە تەناى:** لێ تەنین.

**وەنە تەنیاى:** لێ تەنران.

**وەنە تەوۆسنایۆ:** دڵ لێ ئێشاندن.

**وەنە تەوۆسیایۆ:** دڵ لێ ئێشان.

**وەنە تێك داى:** لێ تێك دان.

**وەنە تێك دریاى:** لێ تێك دران.

**وەنە تێك شی یەى:** لێ تێك چوون.

**وەنە جمایۆ:** پەلە تیا کردن.

**وەنە جمنایۆ:** پەلە لێ کردن.

**وەنە چڕیاى:** بانگ لێ کران.

**وەنە چڕیەى:** بانگ لێ کردن.

**وەنە چیایۆ:** سارد لێ کردنەوە. لێ سارد بوونەوەى عەرەق بە لەشەوە.

**وەنە چیڕناى:** لێ چیڕاندن. لێ ڤیژاندن.

**وەنە چیڕیایۆ:** چیڕە چیڕ بەسەرا کردن.

**وەنە چێقناى:** لێ چیقاندن. لێ ڤیژاندن.

**وەنە چێقیایۆ:** چیقە چیق بە ڕوودا کردن.

**وەنە خراب کەرڎەى:** لێ خراپ کردن. لێ پیس کردن.

**وەنە خڕ بی یەیۆ:** لێ خڕ بوونەوە. لێ کۆ بوونەوە.

**وەنە خڕ کەرڎەیۆ:** لێ خڕ کردنەوە. لێ کۆ کردنەوە.

**وەنە خڕۆشنایۆ:** لێ کۆ کردنەوە. لێ خڕۆشاندنەوە.

**وەنە خڕۆشیایۆ:** لێ خڕۆشانەوە. لێ کۆ بوونەوە.

**وەنە خشناى:** لێ خشاندن.

**وەنە خشیاى:** لێ خشان.

**وەنە خوڕاى:** لێ خوڕین.

**وەنە خوڕیەى:** لێ خوڕین.

**وەنە خێزناى:** تێ بەردان. لێ هەڵساندن.

**وەنە خێزیاى:** تێ بەربوون. لێ هەڵسان.

**وەنە دریاى:** لێدران.

**وەنە دواى:** لێدوان. باس کردن بە خراپە.

**وەنەدەر ، وەنەدەرە:** لێدەر.

**وەنەدیکی:** شووشە

**وەنە دێۆناى:** لێ ورووژاندن.

**وەنە دێۆیاى:** لێ ورووژان.

**وەنە ڕاس بی یەیۆ:** لێ ڕاست بوونەوە.

**وەنە ڕاس کەرڎەیۆ:** لێ ڕاست کردنەوە.

**وەنە ڕەپناى:** لێ ڕەپاندن.

**وەنە زاق کەرڎەیۆ:** لێ زەق کردنەوە.

**وەنە زڕناى:** لێ زڕاندن.

**وەنە زڕیاى:** لێ زڕان.

**وەنە زل بی یەى:** لێ زل بوون. لێ گەورە بوون.

**وەنـە زل كـەرڎەی:** لـێ زل كـردن. لـێ گـەورە كردن.

**وەنە زنیەی:** دەم تێ بەردان. لێ ڕوواندن.

**وەنە زیای:** لێ دەركەوتن. لێ ڕووان.

**وەنە ژلێونایۆ:** پەلە لێ كردن.

**وەنە سڵەمنایۆ:** لێ سڵەماندنەوە.

**وەنە سڵەمیایۆ:** لێ سڵەمینەوە.

**وەنـــە سـوورپیای:** لــێ ســووڕاندن. لــێ چەرخاندن.

**وەنە سووڕیای:** لێ سووڕان. لێ چەرخان.

**وەنە شاتنای:** لێ شاتاندن. لێ قیژاندن.

**وەنە شاتیایۆ:** شاتە شات لێ كردن.

**وەنە شانای:** لێ وەشاندن.

**وەنە شای:** لێ وەشاندن.

**وەنە شنیای:** لێ وەشێنران.

**وەنە شێڕیایۆ:** لێ شیڕانەوە. شیڕە شیڕ كردن لە دژ كەسێك بە تووڕەییەوە.

**وەنە شێونای:** لێ شێواندن.

**وەنە شێویای:** لێ شێوان.

**وەنە شی یەی:** لێ چوون.

**وەنە فاڕای:** لێ گۆڕین.

**وەنە فاڕیای:** لێ گۆڕان.

**وەنە فەریكێ:** فەریكە قەزوان.

**وەنە فیكنای:** فیكە لێ كردن.

**وەنە قرمنای:** لێ قرماندن. تێ قرماندن.

**وەنە قڕنای:** لـێ قڕانـدن. نوقلانـەی خـراپ بۆ لێدان.

**وەنە قریونای:** لێ قریواندن.

**وەنە قۆمنای:** لێ قەوماندن.

**وەنە قۆمیای:** لێ قەومان.

**وەنە قیڕنای:** لێ قیڕاندن. بەسەرا قیڕاندن.

**وەنـــە قیـــژنای:** لـــێ قیژانـــدن. بەســـەرا قیژاندن.

**وەنـــە قیـــژیایۆ:** لـــێ قیژانـــدن. قیـــژە قیـــژ بەسەرا كردن.

**وەنە كریای:** لێ كران.

**وەنە كریایۆ:** لێ كرانەوە.

**وەنە كوای:** لێ كوتان. تێ كوتان.

**وەنە كۆ بی یەیۆ:** لێ كۆ بوونەوە.

**وەنە كۆتەی:** لێ كەوتن. پەند وەرگرتن.

**وەنـــە كەوتـــەیۆ:** بەركەوتنـــەوە. عـــار نـــان. لێكەوتنەوە.

**وەنە كۆ كەرڎەیۆ:** لێ كۆ كردنەوە.

**وەنە كەرڎەی:** لێ كردن. تێ كوتان.

**وەنە كەوتە ، وەنە كەوتێ:** پەند وەرگرتوو. ئاتاج بووگ.

**وەنـــە كەوتـــەی:** پەنـــد وەرگـــرتن. ئاتـــاج پـــێ بوون.

**وەنـــە كەوتـــەیۆ:** لـــێ كەوتنـــەوە. پەنـــد وەرگـــرتن. ئاتـــاج پـــێ بوونـــەوە. مەمنوون بوونەوە.

**ۏەنە كەۏێ:** قەزوانی شین.

**وەن گازنـــای:** مەبەســـت ئیـــشارەت بـــۆ كردنـــە بەوەی كە بەرامبەرەكە بێ دەنگ بێت.

**وەنە گرتەی:** لیٚ گرتن.

**وەنە گرتەیۆ:** لیٚ گرتنەوە.

**وەنە گرمنای:** لیٚ گرماندن.

**وەنە گوم بی یەی:** لیٚ گوم بوون.

**وەنە گوم کەرڎەی:** لیٚ گوم کردن.

**وەنە گونجنای:** بۆ ساز کردن. لیٚ گونجاندن.

**وەنە گونجیای:** لیٚ گونجان. بۆ ساز بوون.

**وەنە گەفای:** لیٚ وەڕین.

**وەنە گیر بی یەی:** لیٚ گیر بوون.

**وەنە گیر کەرڎەی:** لیٚ گیر کردن.

**وەنە گیرنای:** لیٚ گیراندن.

**وەنە گیریای:** لیٚ گیران.

**وەنە گیڤ کەرڎەی:** لیٚ گیف کردن.

**وەنە گیٚلاّی:** لیٚ گەڕان. لیٚ گەڕیان. لیٚ چەرخان.

**وەنە گیٚلاّیۆ:** لیٚ گەڕانەوە. لیٚ چەرخانەوە.

**وەنە گیٚلّنای:** لیٚ گەڕاندن. لیٚ چەرخاندن.

**وەنە گیٚلّنایۆ:** لیٚ گەڕاندنەوە. لیٚ چەرخاندنەوە.

**وەنە گیٚل کەرڎەی:** لیٚ گیٚل کردن.

**وەنە لار بی یەیۆ:** لیٚ لار بوونەوە.

**وەنە لار کەرڎەیۆ:** لیٚ لار کردنەوە.

**وەنە لالّیایۆ:** لیٚ پاڕانەوە.

**وەنە ماشنای:** لیٚ ماشاندن.

**وەنە ماشیای:** لیٚ ماشین. دەست بۆ بردن. لیٚ نەوین. پەلامار دان.

**وەنە مالاّیۆ:** لیٚ مالّینەوە.

**وەنە مدرای:** لیٚ وەستان.

**وەنە مدرایۆ:** لیٚ وەستانەوە.

**وەنە مڕنای:** لیٚ مڕاندن.

**وەنە مرۆشیایۆ:** لیٚ خرۆشانەوە.

**وەنە مشکی:** جۆرە دار قەزوانیٚکە دەنکەکانی ورد و ناسکن.

**وەنە مۆچنای:** لیٚ هاندان. هەلّنانی کەسیٚك لە دژی کەسیٚکی تر بۆ بە گژاچوونی.

**وەنە نریای:** لیٚ نران.

**وەنە نۆیستەی:** لیٚ نووسین.

**وەنە نەڕای:** لیٚ نەڕین. لیٚ گرماندن.

**وەنە نەڕنای:** لیٚ نەڕاندن. لیٚ گرماندن.

**وەنە نەمای:** لیٚ نەوین.

**وەنە نیای:** لیٚ نان. بار کردن.

**وەنە وارای:** لیٚ باریك.

**وەنە واقنای:** لیٚ واقاندن.

**وەنە وانای:** لیٚ خویٚندن. باس کردنی پاشەملە.

**وەنە واونای:** لیٚ واندن. بریتی یە لە راهیٚنانی ئاژەلّ بۆ لاواندنی بەچکەی خۆی.

**وەنە واونایۆ:** مەبەست هۆگر کردنی کەسیٚکە بە کەسیٚکی تر تا ڕووی بداتیٚ و بیگریٚتە خۆی.

**وەنە واویایۆ:** هۆگر بوونی کەسیٚك بە کەسیٚکی تر و لیٚ دوور نەکەوتنەوەی.

**وەنە وچنای:** نیشانە تێ گرتن یان لێگرتن.

**وەنە وْچنای:** لێ بژاردن. لێ چنین.

**وەنە ووڕای:** لێ ڕووخان.

**وەنە ووڕنای:** لێ ڕووخاندن.

**وەنەوز ئەوْە بەرڈەی:** وەنەوز بردنەوە.

**وەنەوز بەرڈەیۆ:** وەنەوز بردنەوە.

**وەنە وْزتەی:** لێ خستن.

**وەنە وْزتەیۆ:** لێ خستنەوە.

**وەنەوزدای:** وەنەوزدان.

**وەنەوزۆ بەرڈەی:** وەنەوز بردنەوە.

**وەنەوزە:** وەنەوز.

**وەنەوزە کوتێ:** وەنەوزە کوتێ.

**وەنەوزی:** وەنەوز.

**وەنە وزیای:** وەنەوز دان. لێ خران. پێوەبەستن.

**وەنە وستەی:** لێ خستن.

**وەنە وستەیۆ:** لێ خستنەوە.

**وەنە وسنای:** لێ خەواندن.

**وەنەوش ، وەنەوشە:** شتی ڕەنگ وەنەوشەیی. شتی ڕەنگ مۆر.

**وەنەوشە:** وەنەوشە.

**وەنەوشەیی:** ڕەنگی وەنەوشەیی. ڕەنگی مۆر.

**وەنە وەردای:** تێ بەردان.

**وەنە وەردریای:** تێ بەردران.

**وەنە وەزتەی:** پیا هەڵگەڕان.

**وەنە وەستەی:** پیا هەڵگەڕان.

**وەنەوەش ئامای:** خۆش لێهاتن. حەز لێ کردن.

**وەنە وەش نامای:** خۆش لێ نەهاتن. حەز لێ نەکردن.

**وەنە وێقنای:** لێ واقاندن.

**وەنە هار بی یەی:** لێ هار بوون.

**وەنە هار کەرڈەی:** لێ هار کردن.

**وەنە هان دای:** لێ هاندان.

**وەنە هۆر ئێزتەی:** لێ هەڵسان.

**وەنە هۆر ئێزنای:** لێ هەڵساندن.

**وەنە هۆر ئێستەی:** لێ هەڵسان.

**وەنە هۆرزتەی:** لێ هەڵسان.

**وەنە هۆرزنای:** لێ هەڵساندن.

**وەنە هۆرستەی:** لێ هەڵسان.

**وەنە هۆر گێڵایۆ:** لێ هەلگەڕانەوە.

**وەنە هۆر گێڵنایۆ:** لێ هەلگەڕاندنەوە.

**وەنەی:** خوێندن.

**وەنە یاوای:** گەیشتنە لا. دەست پێ گەیشتن.

**وەنە یاونای:** گەیاندنە لا. دەست گەیاندنە لا.

**وەنەینە:** لە خوێندندا.

**وەنەیۆ:** خوێندنەوە.

**وەنەیەنە:** لە خوێندندا.

**وْەنی:** قەزوان.

**وْەنین ، وْەنینە:** هەرچی شتێ کە لە قەزوان دروست بکرێت.

**وەو:** دەنگی وەڕینی سەگ. وەڕە.

**وەو وەو:** وەڕەی یەك لەسەر یەکی سەگ.

**وەهـ:** وەها؛ ووتەی سەرسوڕمانە.

**وَەهار:** بەهار.

**وَەهاراوَە:** بەهاراو.

**وَەهاراوَی:** بەهاراو.

**وَەهارۆ:** لە بەهارەوە.

**وَەهارە ، وَەهاریْ:** بەهارە.

**وَەهـارە بـڕیْ:** بـەهارە بـڕ؛ دارانێـك كـە لـە بـەهارا دەبـڕێن و هەڵـدەگیرێن بـۆ سووتەمەنی زستان.

**وَەهارە كاڵ:** بەهارە كێڵ.

**وَەهارەنە:** لە بەهاردا.

**وَەهاریْ:** گەنمە بەهارە.

**وەهاریۆە:** لە بەرهارەوە.

**وەهم بەرذەی:** گومان بردن.

**وەهم كەرذەی:** گومان كردن.

**وەهمە:** وەهم. گومان.

**وەهمی:** وەهم. گومان.

**وەی:** وەی. زیـان. إسمـی إشـارەی نزیكـە. بـە واتـای ((ئــەم، بــەم)). ئــامرازی سەرسـوڕمانە. پـەروەردە و ژیانـدن. خاوەن.

**وەی بە كۆڵ ، وەی بـە كۆڵـە:** زیـان بـە كـۆڵ. شەڕەنگێز.

**وەی بە كۆڵی:** شەڕەنگێزی. زیان بە كۆڵی.

**وەی ذار وەی ذارە:** بـــە وەی. بـــە زیـــان. زیانبەخش.

**وەی ذاری:** بە زیانی. زیانبەخشی.

**وەی ڕۆ:** وەی ڕۆ. ئەی داخ.

**وەیش:** وەیش.

**وەیشومە:** وەیشوومە. بەفر و باران و تۆف و سەرما.

**وەی كریا ، وەی كرییْ:** بەخێو كراو.

**وەی كریای:** بەخێو كران.

**وەی كەر ، وەی كەرە:** بەخێو كەر.

**وەی كەرذەی:** بەخێو كردن.



**وەیل:** وەیل؛ ناوی شوێنێكە لە دۆزەحدا.

**وەیلان ، وەیلانە:** وێڵ.

**وەیلان بی یەی:** وێڵ بوون.

**وەیلان كریای:** وێڵ كران.

**وەیلان كەرذەی:** وێڵ كردن.

**وەیلانیی:** وێڵیی.

**وەیوڵە باذیْ:** بووكە بە بارانیْ.

**وەیوڵە باغێنـە:** بووكڵەی لـە باغـە دروست كراو.

**وەیوڵە جنانیْ:** گێژەڵۆكە.

**وەیوڵە شیشەینە:** بووكڵە شووشە.

**وەیوڵـە كـەر ، وەیوڵـە كـەرە:** كەسـێكە كـە بووكڵەی منالأنە دروست ئەكات.

**وەیوڵـە كــەرذەی:** وەوڵــە كــردن. بووكڵــە دروسات كردن.

**وەیولیْ:** بووكی منالأنە.

**وەیوە:** بووك.

**وەی وەی:** وەی وەی.

**وەی وەی بـــاڵا بـــەرز:** نـــاوی گـــۆرانی یـــەکی هۆرامی یە.

**وەی وەی لەرزانـــە:** نـــاوی گـــۆرانی یـــەکی هۆرامی یە.

**وەیویی:** بووکێنی.

**وەیویەنە:** لە بووکێنیدا.

**وەیەنە:** قووڵینە. لەوەیدا.

**وێ:** خۆ. خود. ناوی پیتی ((و)).

**وی:** وی، وشەیەکە ژنـان لـە جیـاتی ((ئـای)) یـان ((وەی)) بـەکاری ئـەهێنن و لـە سەرسوڕمانیشدا ئەیڵێن.



**ویا:** باریکایی.

**ڤیارای:** ڕابواردن. بواردن. بەجێ هێشتن.

**ڤیارایرە:** بەسەر بردن.

**ڤیاریایۆ:** ئاودانەوەی ڕووەکی تازە ڕوێنراو.

**ڤیارایەرە:** بەسەر بردن.

**ڤیار کەر ، ڤیار کەرە:** ڕاوکەری کاتی بگاری کەو.

**ڤیار کەرڎەی:** ڕاوکردنی کاتی بگاری کەو.

**ڤیارگا:** جێگەی ڕاوی کاتی بگاری کەو.



**ڤیارگە:** جێگەی ڕاوی کاتی بگاری کەو.



**ڤیارە:** بوار. فرسەت. مەجال.

**ڤیارە ڎای:** بوار دان. مەجال پێدان.

**ڤیارە ڎریای:** بوار دران. مەجال پێ دران.

**ڤیارە نەڎای:** بوار نەدان. مەجال پێ نە دان.

**ڤیاری:** کەو بوار.

**ڤیاریا ، ڤیاریێ:** بوێراو. بەجێ هێڵراو.

**ڤیاریای:** بوێران. بەجێ هێڵران.

**ڤیاریایرە:** بەسەر چوون.

**ڤیاریـــایۆ:** ئـــاو درانـــەوەی ڕووەکـــی تـــازە نێژراو.

**ڤیاریایەرە:** بەسەر چوون.

**ڤیاریەنە:** لە کەو بواردا.

**ویانە گرتەی:** بەهانوو گرتن.

**ویانە گێر ، ویان گێرە:** بەهانوو گر.

**ویانێ:** بەهانوو.

**وێ ئاخەنای:** خۆ ئاخنین.

**وێ ئارام ئەوۆ کەرڎەی:** خۆ ئارام کردنەوە.

**وێ ئارام کەرڎەیۆ:** خۆ ئارام کردنەوە.

**وێ ئارامۆ کەرڎەی:** خۆ ئارام کردنەوە.

**وێ ئارایش ڎای:** خۆ ئارایش دان.

**وێ ئارایش کەرڎەی:** خۆ ئارایش کردن.

**وێ ئارڎەیرە:** خۆ ڕاهێنان.

**وێ ئارڎەیۆ وریۆ:** خۆ هێنانەوە یەك.

**وێ ئارڎەیۆ یۆ:** خۆ هێنانەوە یەك.

**وێ ئارڎەیەرە:** خۆ ڕاهێنان.

**وێ ئازتەیرە:** خۆ شۆڕ کردنـەوە. خـۆ ئاتـاج کردن.

**وێ ئازتەیەرە:** خۆ شۆڕ کردنەوە. خۆ ئاتاج کردن.

**وێ ئازیز کەرڎەی:** خۆ ئازیزکردن.

**وێ ئاستەیرە:** خۆ شۆڕ کردنـەوە. خـۆ ئاتـاج کردن.

**وێ ئاستەیەرە:** خۆ شۆڕ کردنەوە. خۆ ئاتاج کردن.

**وێ ئاشکرا کەرڎەی:** خۆ ئاشکرا کردن.

**وێ ئاشنا کەرڎەی:** خۆ ئاشنا کردن.

**وێ ئاورا کەرڎەی:** خۆ برسی کردن.

**وێ ئاوۆرڎەیرە:** خۆ ڕاهێنان.

**وێ ئاوۆرڎەیۆ وریۆ:** خۆ هێنانەوە یەك.

**وێ ئاوۆرڎەیۆ یۆ:** خۆ هێنانەوە یەك.

**وێ ئاوۆرڎەیەرە:** خۆ ڕاهێنان.

**وێ ئەرمانای:** خۆ نوواندن.

**وێ ئەرە ئارڎەی:** خۆ ڕاهێنان.

**وێ ئەرە ئازتەی:** خۆ داهێڵان. خۆ ئاتاج کردن.

**وێ ئەرە ئاستەی:** خۆ داهێڵان. خۆ ئاتاج کردن.

**وێ ئەرە ئالۆچنای:** خۆ شۆڕ کردنەوە.

**وێ ئەرە ئاوۆرڎەی:** خۆ ڕاهێنان.

**وێ ئەرە ئێژنای:** خۆ ڕاکشاندن.

**وێ ئەرە بەزتەی:** خۆ دابەستن. خۆ ئامادە کردن.

**وێ ئەرە بەستەی:** خۆ دابەستن. خۆ ئامادە کردن.

**وێ ئەرە بینای:** خۆ دابەستن. خۆ ئامادە کردن.

**وێ وێ ئەرە پاتەی:** خۆ داپاچین.

**وێ ئەرە پۆژنای:** خۆ داپۆشین.

**وێ ئەرە پێتەی:** خۆ داپێچان.

**وێ ئەرە تە پنای:** خۆ خەمبار کردن.

**وێ ئەرە تەکنای:** خۆ داتەکاندن.

**وێ ئەرە تەمنای:** خۆ زویر کردن.

**وێ ئەرە جمنای:** خۆ خستنە ڕێ.

**وێ ئەرە جومنای:** خۆ خستنە ڕێ.

**وێ ئەرە چکنای:** خۆ ئیفلاس کردن.

**وێ ئەرە دای:** خۆ هاویشتن بەرەو نزمایی.

**وێ ئەرە ڕنیەی:** خۆ داڕنین.

**وێ ئەرە ساکنای:** خۆ داساکاندن. خۆ دامرکاندن.

**وێ ئەرە سڕیەی:** خۆ سڕین لە سەرەوە بۆ خوارەوە.

**وێ ئەرە شانای:** هێز و گوژم دانە خۆ. هەڵمەت بردن.

**وێ ئەرە شای:** هێز و گوژم دانە خۆ.

**وێ ئەرە شتەی:** خۆ داشۆرین. خۆ داشتن.

**وێ ئەرە فەرەقنای:** خۆ دافرەقاندن.

**وێ ئەرە کاسنای:** خۆ داکاسین و دامرکاندن.

**وێ ئەرە کۆای:** خۆ داکوتان.

**وێ ئەرە کەرڎەی:** خۆ داکردن.

**وێ ئەرە کۆمنای:** خۆ دانەواندن. خۆ داکۆماندن.

**وێ ئەرە گرتەی:** خۆ داگرتن.

**وێ ئەرە ماڵای:** خۆ داماڵین.

**وێ ئەرە مەرزنای:** خۆ دامەزراندن.

**وێ ئەرە ناستەی:** خۆ مەحرووم نەکردن.

**وێ ئەرە نامنای:** خۆ دانەواندن.

**وێ ئەرە نیای:** خۆ دانان.

**وێ ئەژناسای:** خۆ ناسین.

**وىْ ئەژناسايۆ:** خۆ ناسينەوە.

**وىْ ئەژناسناى:** خۆ ناساندن.

**وىْ شناساى:** خۆ ناسين.

**وىْ ئەشناسايۆ:** خۆ ناسينەوە.

**وىْ ئەشناسناى:** خۆ ناساندن.

**وىْ ئەنە نياى:** خۆ تێ نان. خۆ تێ خستن.

**وىْ ئەنە ياوناى:** خۆ تێ گەياندن.

**وىْ ئەوَە ئازتەى:** خۆ هێشتنەوە.

**وىْ ئەوَە ئاستەى:** خۆ هێشتنەوە.

**وىْ ئەوَە ئەساى:** خۆ سەندنەوە.

**وىْ ئەوَە ئێزتەى:** خۆ دۆزينەوە.

**وىْ ئەوَە ئێستەى:** خۆ دۆزينەوە.

**وىْ ئەوَە بەزتەى:** خۆ بەستنەوە.

**وىْ ئەوَە بەستەى:** خۆ بەستنەوە.

**وىْ ئەوَە بيناى:** خۆ بەستنەوە.

**وىْ ئەوَە پاك كەرڎەى:** خۆ پاك كردنەوە.

**وىْ ئەوَە پڕناى:** خۆ پەڕاندنەوە. خۆ قوتار كردن.

**وىْ ئەوَە تاوَناى:** خۆ تواندنەوە.

**وىْ ئەوَە تەڤناى:** خۆ تەڤاندنەوە.

**وىْ ئەوَە جمناى:** پەلە كردن. خۆ بزواندن.

**وىْ ئەوَە چەمناى:** خۆ چەماندنەوە.

**وىْ ئەوَە دارناى:** خۆ خستن. خۆ بووردنەوە و خۆ بە لادا هێنان.

**وىْ ئەوَە دزيەى:** خۆ دزينەوە.

**وىْ ئەوَە دى يەى:** خۆ دۆزينەوە. خۆ ديتنەوە.

**وىْ ئەوَە ڕازناى:** خۆ ڕازاندنەوە.

**وىْ ئەوَە ڕووتناى:** خۆ ڕووتاندنەوە.

**وىْ ئەوَە ساناى:** خۆ سەندنەوە.

**وىْ ئەوَە شاراى:** خۆ شاردنەوە.

**وىْ ئەوَە شۆكناى:** خۆ شۆكاندنەوە.

**وىْ ئەوَە كوشتەى:** خۆ كوشتنەوە.

**وىْ ئەوَە كۆمناى:** خۆ چەماندنەوە.

**وىْ ئەوَە كەرڎەى:** خۆ كردنەوە.

**وىْ ئەوَە كێشاى:** خۆ كێشانەوە.

**وىْ ئەوَە كێشتەى:** خۆ كێشانەوە.

**وىْ ئەوَە گرتەى:** خۆ گرتنەوە.

**وىْ ئەوَە گەزتەى:** خۆ گەزتنەوە.

**وىْ ئەوَە گەستەى:** خۆ گەزتنەوە.

**وىْ ئەوَە لاوَناى:** خۆ لاواندنەوە.

**وىْ ئەوَە لێستەى:** خۆ ئارايشدان. بە تەوەسەوە ئەوترێت.

**وىْ ئەوَە ماڕاى:** خۆ شكاندنەوە.

**وىْ ئەوَە نە ماڕاى:** خۆ نە شكاندنەوە.

**وىْ ئەوَە وارڎەى:** خۆ خواردنەوە.

**وىْ ئێزتەيۆ:** خۆ دۆزينەوە.

**وىْ ئێستەيۆ:** خۆ دۆزينەوە.

**وىْ بار كەرڎەى:** خۆ بار كردن. خۆ قەرزار كردن.

**وىْ بڕيەى:** خۆ بڕين.

**وىْ بەرڎەى وَەرۆ:** خۆ بردنە پێشەوە.

**وىْ بەرز ئەوَە كەرڎەى:** خۆ بەرز كردنەوە.

**وىْ بەرز كەرڎەيۆ:** خۆ بەرز كردنەوە.

**وێ بەرزۆ کەرڎەی:** خۆ بەرز کردنەوە.

**وێ بەر کەرڎەی:** خۆ دەرکردن.

**وێ بەر ۆزتەی:** خۆ دەرخستن.

**وێ بەر وستەی:** خۆ دەرخستن.

**وێ بەزتەی:** خۆ بەستن.

**وێ بەزتەیۆ:** خۆ بەستنەوە.

**وێ بەستەی:** خۆ بەستن.

**وێ بەستەیۆ:** خۆ بەستنەوە.

**وێ بەو وێ بی یەی:** خۆ بە خۆ بوون؛ جۆرە ووتەیەکی سووکایەتی پێ کردنە.

**وێ بە وێ کەرڎەی:** خۆ بە خۆ کردن.

**وێ بینای:** خۆ بەستن. خۆ ئامادە کردن.

**وێ بینایرە:** خۆ دابەستن.

**وێ بینایۆ:** خۆ بەستنەوە.

**وێ بینایەرە:** خۆ دابەستن.

**وێ پاتەیرە:** خۆ داپاچین.

**وێ پاتەیۆ:** خۆ پاچینەوە.

**وێ پاتەیەرە:** خۆ داپاچین.

**وێ پارێزنای:** خۆ پاراستن.

**وێ پاك ئەۆە کەرڎەی:** خۆ پاك کردنەوە.

**وێ پاك کەرڎەیۆ:** خۆ پاك کردنەوە.

**وێ پاکۆ کەرڎەی:** خۆ پاك کردنەوە.

**وێ پاڵ ۆزتەی:** خۆ پاڵ خستن.

**وێ پاڵ وستەی:** خۆ پاڵ خستن.

**وێ پان ئەۆە کەرڎەی:** خۆ پان کردنەوە.

**وێ پان کەرڎەیۆ:** خۆ پان کردنەوە.

**وێ پانۆ کەرڎەی:** خۆ پان کردنەوە.

**وێ پرس ، وێ پرسە :** خۆ پەرست.

**وێ پرسی :** خۆ پەرستی.

**وێ پڕنایۆ:** خۆ پەڕاندنەوە. خۆ قوتار کردن.

**وێ پۆژنایرە:** خۆ داپۆشین.

**وێ پۆژنایەرە:** خۆ داپۆشین.

**وێ پۆشتە ئەۆە کەرڎەی:** خۆ پۆشتە کردنەوە.

**وێ پۆشتە کەرڎەیۆ:** خۆ پۆشتە کردنەوە.

**وێ پەس کەرڎەی:** خۆ پەست کردن.

**وێ پەسەن ، وێ پەسەنە :** خۆ پەسەند.

**وێ پەسەنڎ ، وێ پەسەنڎە:** خۆ پەسەند.

**وێ پەسەنڎی:** خۆ پەسەندی.

**وێ پەسەننی:** خۆ پەسەندی.

**وێ پەك دای:** خۆ پەك دان. خۆ تەواو ماندوو کردن.

**وێ پیر کەرڎەی:** خۆ پیر کردن.

**وێ پیس کەرڎەی:** خۆ پیس کردن.

**وێت:** خۆت؛ وتەیەکە لەدوای ((شێت و)) دێت.

**ویت:** دەنگی مەلە؛ لەدوای ((ویتە)) دێت.

**وێت ئاسا :** خۆت ئاسا.

**وێت ئاسایی:** خۆت ئاسایی.

**وێتا :** خۆتان.

**وێتا ئاسایی:** خۆتان ئاسایی.

**وێ تاسنای:** خۆ تاساندن. خۆ خنکاندن.

**وێ تاق ئەۆە کەرڎەی:** خۆ تاك کردنەوە.

**وێ تاق کەرڤەیۆ:** خۆ تاك كردنەوە.

**وێ تاقۆ کەرڤەی:** خۆ تاك كردنەوە.

**وێ تاقی ئەوە کەرڤەی:** خۆ تاقی كردنەوە.

**وێ تاقی کەرڤەیۆ:** خۆ تاقی كردنەوە.

**وێ تاقیۆ کەرڤەی:** خۆ تاقی كردنەوە.

**وێ تاڵ کەرڤەی:** خۆتاڵ كردن.

**وێتانە ، وێتانێ:** خۆتانە.

**وێتاوە:** لە خۆتانەوە.

**ویترە:** فترە؛ وشەیەکە لەدوای ((سەر)) دێت.

**ویتنای:** ویتە ویت كردن. ورتە ورت كردنی نزم.

**وێتۆ:** لە خۆتەوە.

**ویتە:** ویتە. دەنگێکی نەرمی نزمی پەلەوەرە.

**وێ تەڤنایۆ:** خۆ تەڤاندنەوە.

**وێ تەریق ئەوە نەکەرڤەی:** خۆ تەریق نەكردنەوە.

**وێ تەریق نەکەرڤەیۆ:** خۆ تەریق نەكردنەوە.

**وێ تەریقۆ نەکەرڤەی:** خۆ تەریق نەكردنەوە.

**وێ تەڕ کەرڤەی:** خۆ تەڕ كردن.

**وێ تەسك ئەوە کەرڤەی:** خۆ تەسك كردنەوە.

**وێ تەسك کەرڤەیۆ:** خۆ تەسك كردنەوە.

**وێ تەسکۆ کەرڤەی:** خۆ تەسك كردنەوە.

**وێ تەکنای:** خۆ تەكاندن.

**وێ تەکنایرە:** خۆ داتەكاندن. خۆ ڕاپسكاندن.

**وێ تەکنایەرە:** خۆ داتەكاندن. خۆ ڕاپسكاندن.

**وێ تەمنایرە:** خۆ خەمبار كردن.

**وێ تەمنایەرە:** خۆ خەمبار كردن

**وێتەرە:** بە خۆتا.

**وێتەنە:** لە خۆتا.

**ویتە ویت:** وتە وت.

**ۆێتەی:** پێژان.

**ۆێتەینە:** لە پێژاندا.

**ۆێتەیۆ:** پێژانەوە.

**وێ تێر کەرڤەی:** خۆ تێر كردن.

**وێ تیژ کەرڤەی:** خۆ تیژ كردن.

**وێ تێك دای:** خۆ تێك دان. خۆ تێگەیاندن.

**وێ تێك نەڤای:** خۆ تێك نەدان. گوێ پێ نەدان.

**وێ جاکنایۆ:** دەست بە خۆدا هێنان.

**وێجدان:** ویجدان. ویژدان.

**وێجداندار ، وێجداندارە:** بە ویجدان.

**وێجدانداری:** بە ویجدانی.

**وێجدانەنە:** لە ویجداندا.

**وێ جمنایۆ:** خۆ جووڵاندنەوە. پەلە كردن.

**وێ جووڵنای:** خۆ جووڵاندن.

**وێ جەڕ دای:** خۆ توند بەستن.

**وێ جیا ئەوە کەرڤەی:** خۆ جیا كردنەوە.

**وێ جیا کەرڎەیۆ:** خۆ جیا کردنەوە.

**ۏێچ ، ۏێچە:** پاشگری بە واتا ((پێژ)).

**وێچت:** خۆیشت.

**وێچتا:** خۆیشتان.

**وێچش:** خۆیشی.

**وێچشا:** خۆیشیان.

**وێچم:** خۆیشم.

**وێچما:** خۆیشمان.

**ۏێچنە:** بێژنگ.

**ۏێچنەنە:** لە بێژنگدا.

**وێ چۆڕنایرە:** خۆ داچۆڕاندن.

**وێ چۆڕنایەرە:** خۆ داچۆڕاندن.

**وێ چەرب کەرڎەی:** خۆ چەور کردن.

**وێ چەرمە ئەۏە کەرڎەی:** خۆ سپی کردنەوە.

**وێ چەرمە کەرڎەیۆ:** خۆ سپی کردنەوە.

**وێ چەرمۆ کەرڎەی:** خۆ سپی کردنەوە.

**وێ چەمنایۆ:** خۆ چەماندنەوە.

**وێچیا ، وێچییێ:** پێژراو.

**ۏێچیای:** پێژران.

**ۏێچایۆ:** پێژرانەوە.

**وێ حازر کەرڎەی:** خۆ ئامادە کردن.

**وێ حەشار دای:** خۆ حەشار دان.

**وێ حەنڎ:** عاستی خۆ. لە پاڵ خۆ. لە ئاست خۆ.

**وێ خاس کەرڎەی:** خۆ چاك کردن.

**وێ خاۏنای:** خاوە خاو بە خۆ کردن. خۆ پەشۆکانن.

**وێ خپ کەرڎەی:** خۆ مراندن.

**وێ خجڵنای:** خۆ پەشۆکاندن.

**وێ خرابنای:** خۆ خراپ کردن.

**وێ خزنای:** خۆ خزاندن.

**وێ خزنایرە:** خۆ داخزاندن.

**وێ خزنایەرە:** خۆ داخزاندن.

**وێ خشنای:** خۆ خشاندن.

**وێ خشنایرە:** خۆ داخشاندن.

**وێ خشنایەرە:** خۆ داخشاندن.

**وێ خەریك کەرڎەی:** خۆ خەریك کردن.

**وێ خەریکنای:** خۆ خەریك کردن.

**وێ خەسنای:** خۆ خەساندن.

**وێ خەفە ئەۏە کەرڎەی:** خۆ خەفە کردنەوە.

**وێ خەفە کەرڎەیۆ:** خۆ خەفە کردنەوە.

**وێ خەفۆ کەرڎەی:** خۆ خەفە کردنەوە.

**وێ خەلافنای:** خۆ خلافاندن.

**وێ خەڵەتنای:** خۆ خەڵەتاندن.

**وێ خیش کەرڎەی:** خۆ قەڵەو کردن.

**وێ خۆێل کەرڎەی:** خۆ خێل کردن.

**وێ دارنایۆ:** خۆ هێنان بە لادا. خۆ داراندنەوە.

**وێ دای دەسۆ:** خۆ بە دەستە دان.

**وێ دزیەیۆ:** خۆ دزینەوە.

**وێ دای ۏنە:** خۆ لێدان.

**وێ دما ۏزتەی:** خۆ دوا خستن.

**وێ دما وستەی:** خۆ دوا خستن.

**وێ دیاری کەرڎەی:** خۆ دیاری کردن.

**وێ دی یەیۆ:** خۆ دیتنەوە. خۆ دزینەوە.

**ڤیر:** بیر. فکر.

**ویـر ، ویـره:** لار. خـوار؛ لـەدوای ((لار و)) دێت.

**ویر ئارڎەیۆ:** وە بیر هێنانەوە.

**ویر ئامای:** وە بیرهاتن. بیرهاتن.

**ویر ئامایۆ:** بیرهاتنەوە. وە بیرهاتنەوە.

**ویرئاوڕڎەیۆ:** وە بیرهێنانەوە.

**ویرارڎەیۆ:** وە بیرهێنانەوە.

**ڤێران ، ڤێرانە:** وێران.

**ڤێران ئەوە کەرڎەی:** وێران کردنەوە.

**ڤێران بی یەی:** وێران بوون.

**ڤێرانکاری:** وێرانکاری.

**ڤێرانکاریەنە:** لە وێرانکاریدا.

**ڤێران کریا ، ڤێران کریێ:** وێران کراو.

**ڤێران کریای:** وێران کران.

**ڤێرانکەر ، ڤێرانکەرە:** وێرانکەر.

**ڤێران کەرڎەی:** وێران کردن.

**ڤێران کەرڎەیۆ:** وێران کردنەوە.

**ڤێرانۆ کەرڎەی:** وێران کردنەوە.

**ڤێرانە ، ڤێرانێ:** وێرانە.

**ڤێرانە وەر ، ڤێرانە وەرە:** وێرانە خۆر.

**ڤێرانە وەری:** وێرانە خۆری.

**ڤێرانی:** وێرانی.

**ڤێرانیەنە:** لە وێرانیدا.

**ڤیـر ئـەوە بریـا ، ڤیـر ئـەوە بریـێ:** لـە بـیر براوە.

**ڤیر ئەوە بریای:** لە بیر برانەوە.

**ڤیـر ئـەوە بـەر ، ڤیـر ئـەوە بـەرە:** لـە بـیر بەرەوە.

**ڤیر ئەوە بەرڎەی:** لە بیربردنەوە.

**ڤیر ئەوە شنیەی:** لە بیربردنەوە.

**ڤیر ئەوە شی یەی:** لە بیرچوونەوە.

**ڤیر ئەوە کۆتەی:** بیرکەوتنەوە.

**ڤیر ئەوە کەر ، ڤیر ئەوە کەرە:** بیرکەرەوە.

**ڤیر ئەوە کەرڎەی:** بیرکردنەوە.

**ڤیر ئەوە کەوتەی:** بیرکەوتنەوە.

**ڤیر ئەوە نامای:** بە بیرنەهاتنەوە.

**ڤیر ئەوە ڤزتەی:** بیرخستنەوە.

**ڤیر ئەوە وستەی:** بیرخستنەوە.

**ڤیر بریایۆ:** لە بیربرانەوە.

**ڤیر بەرڎەیۆ:** لە بیربردنەوە.

**ڤیر بی یەی:** لە بیربوون.

**ڤیر تەسك ، ڤیر تەسکە:** بیر تەسك.

**ڤیر تەسکی:** بیر تەسکی.

**ڤیر تیژ ، ڤیر تیژە:** بیر تیژ.

**ڤیر تیژی:** بیر تیژی.

**وێرڎ:** وێر. ویرد.

**وێرڎ کەرڎەی:** وێر کردن.

**وێرڎ وانای:** ویرد خوێندن.

**وێرڎ وەنای:** ویرد خوێندن.

**ڤیر ڕۆشن ، ڤیر ڕۆشنە:** بیر ڕۆشن.

**ڤیر ڕۆشنی:** بیر ڕۆشنی. ڕووناك بیری.

**ڤیر ساف ، ڤیر سافە:** بیر ساف.

**ڤیر سافی**: بیر ساف.

**ڤیر شنیەیۆ**: لە بیر بردنەوە.

**ڤیر شی یەی**: لەبیر چوون.

**ڤیر شی یەیۆ**: لەبیر چوونەوە.

**ڤێرك**: حاستی خۆ. حەنی خۆ.

**ڤیر کۆتەیۆ**: بیرکەوتنەوە. هاتنەوە بیر.

**ڤیر کەرڎەیۆ**: بیرکردنەوە.

**ڤیر کەوتەیۆ**: بیر کەوتنەوە.

**ڤیرمەنڎ ، ڤیرمەنڎە**: بیرمەند.

**ڤیرمەنڎیی**: بیرمەندیی.

**ڤیر مەنەی**: لە بیرمان.

**ڤیڕنای**: ویرە ویڕ کردن.

**ڤیرۆ بریای**: لەبیربرانەوە.

**ڤیرۆ بەرڎەی**: لەبیربردنەوە.

**ڤیرۆ شنیەی**: لەبیربرانەوە.

**ڤیرۆ شی یەی**: لەبیر چوونەوە.

**ڤیرۆ کۆتەی**: بیر کەوتنەوە.

**ڤیرۆ کەرڎەی**: بیر کردنەوە.

**ڤیرۆ کەوتەی**: بیر کەوتنەوە.

**ڤیرۆ ڤزتەی**: بیر خستنەوە.

**ڤیرۆ وستەی**: بیر خستنەوە.

**ڤیڕە**: دەنگی گڕی ناخۆشی گریان. ویرە.

**ڤێرەگا**: ئێوارە.

**ڤێرەگانا**: ئێواران.

**ڤێرەگانە**: لە ئێوارەدا.

**ڤێرەگاوە**: لە ئێوارەوە.

**ڤێرەگا وەختە**: کاتی ئێوارە. دەمەو ئێوارە.

**ڤێرەگە**: ئێوارە.

**ڤیرەوەری**: بیرەوەری.

**ڤیڕە ڤیڕ**: ویرە ویڕ.

**ڤیڕە ڤیڕ کەرڎەی**: ویرە ویڕ کردن.

**ڤیْ ڕێك کەرڎەی**: خۆ ڕێك کردن.

**ڤیْ ڕێك ڤزتەی**: خۆ ڕێك خستن.

**ڤیْ ڕێك وستەی**: خۆ ڕێك خستن.

**ڤێڕی**: بگار. شوێنی مەبەست.

**ڤیزنای**: ویزە ویز کردن.

**ڤیْ زنیەیۆ**: خۆ دەرکردن. خۆ دەرهێنانەوە.

**ڤیزە**: ویزە؛ دەنگێکە وەك گیزە.

**ڤیزە بڕیای**: ویزە لێ بڕان.

**ڤیزە بڕیەی**: ویزە لێ بڕین.

**ڤیزە چنیای**: ویزە لێ بڕان.

**ڤیزە چنیەی**: ویزە لێ بڕین.

**ڤێزەنگی**: ئاوزەنگی.

**ڤیزە ڤیز**: ویزە ویز.

**ڤێژدان**: ویژدان. ویجدان.

**ڤێژداندار ، ڤێژداندارە**: بە ویجدان.

**ڤێژدانداری**: بە ویجدانی. بە ویژدانی.

**ڤیْ ژووژ ئەوە کەرڎەی**: خۆ گورج و گۆڵ کردنەوە.

**ڤیْ ژووژ کەرڎەیۆ**: خۆ گورج و گۆڵ کردنەوە

**ڤیْ ژووژۆ کەرڎەی**: خۆ گورج و گۆڵ کردنەوە

**ڤێژە**: باوێشك.

**وێژه ئازتەیره:** باوێشك دان.

**وێژه ئازتەیۆ:** باوێشك دان.

**وێژه ئازتەیەره:** باوێشك دان.

**وێژه ئاستەیره:** باوێشك دان.

**وێژه ئاستەیۆ:** باوێشك دان.

**وێژه ئاستەیەره:** باوێشك دان.

**وێژه ئەره ئازتەی:** باوێشك دان.

**وێژه ئەره ئاستەی:** باوێشك دان.

**وێژه ئەوە ئازتەی:** باوێشك دان.

**وێژه ئەوە ئاستەی:** باوێشك دان.



**وێژەن :** بنێشت.

**وێژەنکەر ، وێژەنکەره:** بنێشت کەر.

**وێژەن کەرذەی:** بنێشت کردن.

**وێژەنه تاڵە:** بنێشته تاڵە. بنێشتی خۆش نەکراو.

**ویٚ ژیۆنای:** خۆ ژیاندن.

**وێس:** بیست.

**ویٚ سانایۆ:** خۆ سەندنەوە.

**ویٚ ساوای پۆره:** خۆ پیا سووین.

**وێسك:** بەشێك لە هێشووی ترێ.

**وێسکی :** ویسکی؛ جۆرێکە لە مەی.

**وێسۆ:** لە بیستەوە.

**وێس و چوار سەعاته :** بیست و چوار سەعاتە.

**ویٚ سوور ئەوە کەرذەی:** خۆ سوور کردنەوە.

**ویٚ سووڕدای:** خۆ سووڕدان. خۆ بادان.

**ویٚ سوور کەرذەیۆ:** خۆ سوور کردنەوە.

**ویٚ سووروٚ کەرذەی:** خۆ سوور کردنەوە.

**ویٚ سووك کەرذەی:** خۆ سووك کردن.

**ویسهەم ، ویسهەمە :** بیستەم.

**ویسهەمی:** بیستەمی.

**ویسهەمین ، ویسهەمینه :** بیستەمین.

**وێسەم ، وێسەمە :** بیستەم.

**وێسەمی :** بیستەمی.

**ویسەمین ، ویسەمینه :**

**وێسەمینی :** بیستەمینی.



**وێش :** خۆی.

**وێش ئاسا :** خۆی ئاسایی.

**وێشا :** خۆیان.

**ویٚ شارایۆ:** خۆ شاردنەوە.

**ویٚ شانایره:** هەڵمەت بردن. خۆ ڕاپسکاندن.

**ویٚ شانایەره:** هەڵمەت بردن. خۆ ڕاپسکاندن.

**وێشاوَاتەنی:** خۆیان گوتەنی.

**وێشانه ، وێشانیٚ:** شتی خۆیانە.

**وێشاوَه:** لە خۆیانەوە.

**ویٚ شتەی:** خۆشتن.

**ویٚ شتەیراوَه:** خۆ داشۆرینەوە.

**ویٚ شتەیره:** خۆ داشۆرین.

**ویٚ شتەیەنه :** لە خۆشتندا.

**ویٚ شل کەرذەی:** خۆ شل کردن.

**وێشۆ:** لە خۆیەوە.

**وێشوَارای:** خۆ گوشین.

**ویٚ شۆڕ ئەوَه کەرذەی:** خۆ شۆڕ کردنەوە.

